(٢)

(کورتە رۆمان)

# دیـــلی قـــەفقاز

لیۆن تۆلستۆی

وەرگێڕانی

ئەمین گەردیگلانی





دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

● دیلی قەفقاز

● نووسینی: لیۆن تۆلستۆی

● وەرگێڕانی: ئەمین گەردیگلانی

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● پیتچنین: محەمەد ئەمین شاسەنەم

● بەرگ: هۆگر سدیق

● ژمارەی سپاردن: ٦٧٣ لە ٢٠١١ دراوەتێ

● نرخ: ٢٥٠٠ دینار

● چاپی یەکەم ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٥٧٣ )



www.mukiryani.com : ماڵپەڕ

info@mukiryani.com : ئیمەیل

## (١)

ئەفسەرێکی دەوڵەمەند لە قەفقاز خزمەتی دەکرد کە ناوی ژیلین بوو.

لە کاتی خزمەتەکەیدا ڕۆژێک نامەیەکی لە لایەن دایکە بەساڵاچووەکەیەوە بە دەست گەیشت کە ئەمە ناوەڕۆکی نامەکە بوو:

«من پیر و کەلەلا بووم و لە خودا دەپاڕێمەوە بەر لەوەی مەرگ بەرۆکم پێبگرێ ڕۆڵە خۆشەویست و نازدارەکەم ببینم. کوڕە شیرینەکەم! تکایە وەرەوە بۆلام با دیدارەوئاخر نەبم و جارێکیتر چاوم پێتبکەوێت و خۆت بە خاکم بسپێرە. هیوادارم دوای ئەوە بگەڕێیتەوە سەر ئیش و خزمەتەکەت و درێژەی پێبدەی. لەگەڵ ئەوەشدا من کچێکی شۆخوشەنگ و ژیر و ئاساییم بۆ دۆزیویەتەوە و دڵنیام بە دڵت دەبێ و ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێک دێنی.»

ژیلین دوای خوێندنەوەی نامەکە خەیاڵ هەڵیگرت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڕاستی وایە، دایکم زۆر پیر بووە و ئەگەر خۆم بگنخێنم و خەمساردی بنوێنم لەوانەیە ئیتر چاوم پێینەکەوێتەوە و دیدارەوئاخر بم، کەوایە وا باشە هەرچی زووتر وەرێبکەوم و چاوم پێیبکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کچەکەم کەوتە بەردڵ و زانیم ئافرەتێکی وریا و باش و چاوکراوەیە زەماوەندی لەگەڵدا دەکەم و ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکدەهێنم.»

ژیلین دوای ئەوەی بە وردی بیری لێکردەوە، چوو بۆ لای فەرماندەری هەنگەکەیان، مۆڵەتی لێخواست و لە کۆڕێکی میوانیدا کە



بە چوار بتڵی گەورە ڤۆدکا ڕازابۆوە ماڵئاوایی لە دۆستان و هاوقەتارانی کرد.

لەو کاتەدا کە ژیلین مۆڵەتی وەرگرت لە قەفقاز شەڕ بوو.

سەفەر و هاتوچۆ بە ڕێگا و جادەکاندا لەو سەروبەندەدا زۆر دژوار و پڕمەترسی بوو. بۆ وێنە ئەگەر کەسێکی ڕووسی لە دەرەوەی شار و لە ڕێگا تووشی تاتارەکان بووایەت بە دیلیان دەگرت و ئەو گیرانەی یان دەبووە هۆی مەرگی و لەڕێوە دەیانکوشت، یان دەسبەسەریان دەکرا و پەلکێشیان دەکرد بۆ بەندیخانە. بۆیە هێندێ جار ئەگەر تاقمێک بیانویستبایە یەکدوو حەوتوو جارێک بۆ شارێکیتر سەفەر بکەن، تاقمێک سەربازی چەکدار لە پاش و پێشی کاروانەکەیانەوە دەڕۆیشتن و پارێزگارییان لێدەکردن.

وەرزی هاوین بوو کە ژیلین بڕیاری سەفەریدا و تاقمێک سەرباز و چەند عارەبانە لە پشت قەڵاکە ئامادە ڕاوەستابوون، پاشان وەڕێکەوتن. ژیلین بە سواری ئەسپ لە پێش عارەبانە و سەربازەکانەوە دەڕۆیشت. ئەو کاروانە دەبوو بیستوپێنج وێرست ڕێگا ببڕێ جا دەگەیشتە شوێنی مەبەست. کاروانەکە بە شێوەیەکی ئارام و تایبەت درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی دەدا و هێندێجار سەربازەکان ڕادەوەستان، هێندێجاریش تایەی یەکێک لە عارەبانەکان دەردەپەڕی یان تێکدەشکا، بڕێجاریش ئەسپێک بڕستی لێدەبڕا و ناچار دەبوون ڕاوەستن هەتا دەحەسایەوە و هێز و گوڕی دەهاتەوە بەر. هەربۆیە ئەوانەی پێشەنگی کاروانەکە بوون بە ناچاری لە

سەریان ڕادەوەستان تاکوو هاوڕێکانیان پشوو بدەن و عارەبانەکانیان چاک بکەنەوە و ڕێگا بگرنەوە بەر.

ماوەیەکی لە نیوەڕۆ لادابوو بەڵام کاروانەکەیان هێشتا نیوەی ڕێگاکەی نەبڕیبوو. هەتاوی چلەی هاوین بە قرچە و کوڵەکوڵی تاقەتپڕووکێنی خۆی برستی لێبڕیبوون. تەپوتۆز و گەرما وای لێکردبوون کە زۆر بە دژواری دەیانتوانی درێژە بە ڕێگاکەیان بدەن و لەگەڵ ئەوەشدا شوێنێکی ئەوتۆیان بەچاو نەدەکرد کە پەنا و سێبەرێک بێت و بتوانن وچانێکی لێبگرن و بحەسێنەوە. دەشتێکی قاقڕ و کاکیبەکاکی و هەتا چاو هەتەری دەکرد جگە لە ئاسۆیەکی دوور و بێسنوور هیچ نیسێ و دار و باخێک بەدی نەدەکرا و تەنانەت دەوەن و بنچکە گیایەکیش وەبەرچاو نەدەهات.

لە ناکاو ژیلین لە پشت سەریەوە دەنگی کەڕەنایەکی بیست و چاوەڕوان ما کە کاروانەکە پێیبگاتەوە. لەو کاتەدا بیری کردەوە: «یانی دەبێ زۆر چاوەڕێ ڕاوەستم هەتا سەربازەکان پێم دەگەنەوە؟ یان بەبێ ئەوان دەتوانم بە تەنیا درێژە بە ڕێگاکە بدەم؟ ئەم ئەسپەی کە لە ژێرمدایە زۆر خۆشبەز و چالاکە. بۆ وێنە ئەگەر بەو ئەسپە غار بدەم و لە ڕێگا تووشی تاتارەکان بم، بەم ئەسپە گورج و خۆشبەزە دەتوانم خۆم لە چنگیان دەرباز بکەم؟...»

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەروا دوودڵ و ڕاڕا بوو کە بۆ پێشەوە تێیتەقێنێ یان نا؟ لەو کاتەدا نەیدەتوانی بڕیار بدات. کاتێک چاوی لە پشتسەری خۆی کرد، کاستیلن ئەفسەری هاوڕێی و دۆستی وەفادار



و خۆشەویستی خۆی دی کە خەریکە پێیدەگاتەوە. کاستیلین کە چەکی بە شانەوە بوو لێی نزیک بۆوە و گوتی:

دەبێ وەڕێ بکەوین و لەوە زیاتر ڕانەوەستین چونکە بە هۆی برسییەتییەوە ئیتر هێز و بڕستمان لێبڕاوە و گەرماش ئەوە تەنگی پێهەڵچنیوین و کراسەکەم لە ئارەقەدا خووساوە و دەڵێی لە ئاوت هەڵکێشاوە. کاستیلین پیاوێکی قەڵەوە و سوورهوول بوو و عارەقە زەنگوڵ زەنگوڵ بە ڕوومەت و لاملیدا دەهاتە خوارێ. ژیلین دوای تۆزێ بیر کردنەوە گوتی:

– تۆ تفەنگەکەت ئامادە و پڕ گوللەیە یان نا؟

– بەڵێ پڕە.

– زۆر باشە کەوایە با بڕۆین. بەڵام دەبێ بەڵێن بە یەکتر بدەین بە هیچ شێوەیەک لە یەک هەڵنەبڕێین.

دووبەدوو ملی ڕێیان گرت و بۆ پێشەوە غاریاندا ئەسپییان خستە چوارناڵ.

بەو شێوەیە ڕێگەی بیابانیان گرتەبەر و جاروبار ئاوڕیان بۆ دواوە دەدایەوە بەڵام جگە لە بیابانی وشک و قاقڕ و ڕووتەن هیچ شتێکی دیکەیان نەدەدی.

دوای ئەوەی بە جووت ماوەیەک ڕێیان بڕی لە بیابانەکە تێپەڕین، لە نێوان گرد و کێوەکاندا کەوتنە سەر ڕێگایەک. ژیلین بە هاوڕێکەی خۆی گوت:

– وا چاکە بەو کێوەدا هەڵگەڕێین و بە وردی چاوێک لە دەوروبەر بکەین، لەوانەیە تاتارەکان بۆسەیان نابێتەوە و کتوپڕ غافڵگیرمان بکەن.

کاستیلین گوتی:

– چاو لە کوێ بکەین؟ چاکتر وایە بە پڕتاو ڕێگە ببڕین و کات بە فیڕۆ نەدەین.

ژیلین گوێی بە قسەی کاستیلین نەدا و گوتی:

– نا، تۆ ئەگەر ناتوانی بە کێوەکەدا هەڵگەڕێی، لەم خوارەوە ڕاوەستە و چاوەڕێبە هەتا من دەچمە سەرکێوەکە و بە وردی چاو لە دەوروبەر دەکەم.

پاشان مامزەی لە ئەسپەکەیدا و بە لای چەپیدا و بە تیرەشانی کێوەکەدا وەسەر کەوت. ئەسپەکەی ژیلین لە ڕادەبەدەر گورج و خۆشبەز بوو: (ئەو لە نێو ڕەوەیەک ئەسپدا هەڵبژاردبوو و بە سەد ڕۆبڵ کڕیبووی. هەرخۆشی گرتبووی و ڕایهێنابوو.) ژیلین گەیشتە سەر لووتکەی کێوەکە و کاتی هاتنەخوارێ ئەسپەکەی بە پڕتاو داگەڕا و وەک با و بۆران بەرەو نشێو پێیپێوەنا. بەڵام هێشتا لە هاوڕێکەی نزیک نەبووبۆوە کە لە ناکاو سەری بەرز کردەوە و بەرەورووی خۆی دیتی نزیکەی سی سواری تاتاری ڕاوەستاون. ژیلین لەگەڵ دیتنی تاتارەکان سەری ئەسپەکەی بۆ دواوە وەرسووڕاند و بە هەردوو لاقی لە لاتەڕافی ئەسپەکەی کوتا و بۆ دواوە تێیتەقاند. ئەسپەکەشی کەوتە چوارناڵ و وەک بای شەماڵ فڕی. تاتارەکان کە دیتیان ژیلین سەری ئەسپەکەی وەرسووڕاند و



گەڕایەوە، برووسکەئاسا کەوتنە شوێنی. خرمەی پێی ئەسپەکانیان شاخ و پێدەشتی خستە لەرزین و ئامادە و چەک لە دەست وەدووی کەوتن. ژیلین لەگەڵ ئەوەی هاواری لە کاستیلین دەکرد چەکەکەی ئامادە بکات. بە سەرەولێژیدا وەک بای شەماڵ دادەگەڕا و لەگەڵ ئەوەی ئەسپەکەی بە چوارناڵ غاری دەدا و دەتکوت بە حەواوە دەفڕێ، بە ئەسپەکەی دەگوت: «دەی بە قوربانت بم لە چنگ ئەو تاتارانە دەربازم بکە، وریابە سەرسم نەدەی و لاقت لە کەندولەند و بەردان نەکەوێ، بێتوو سەرەنگرێ بیت و بگلێی، قورمان بە سەردا دەکرێ و هەردووکمان لە نێو دەچین. ئەگەر دەستم بە تفەنگ ڕابگا خۆڕاگری دەکەم و قەت خۆم بە دەستەوە نادەم!»

بەڵام کاستیلین هەر لەگەڵ دیتنی تاتارەکان، بێئەوەی کات بەفیڕۆ بدات سەری ئەسپەکەی بەرەو قەڵا وەرگێڕایەوە و بۆ دواوە تێیتەقاند. بە ڕاست و بە چەپ قامچیی لە ئەسپەکە ڕادەکێشا و مامزەی لە لاتەڕاف و پاڵووی دەکوتا و دەیویست هەرچۆنێکە، خۆی لە چنگی ئەو مەترسییە دەرباز بکات. لە نێو تەپوتۆز و غوماردا تەنیا کلکی ئەسپەکەی دیاربوو.

ژیلین دیتی زۆر پیسی لێقەوماوە و کەوتۆتە بارودۆخێکی پڕمەترسییەوە، کاستیلین تفەنگەکەی لەگەڵ خۆی بردووە و بە شمشێریش هیچ بەرەڤانییەکی پێناکرێ. بەو هیوایەی خۆی لە چنگ تاتارەکان دەرباز بکات بە خێراییەکی بێوێنە و چاوەڕواننەکراوەوە غاریدا و دەیویست خۆی بگەیێنێتە لای سەربازەکان. بەڵام کتوپڕ دیتی شەش سواری تاتار سەر ڕێگاکەیان لێگرتووە. دەتگوت

ئەسپەکەی نێزەکە و بە ئاسماندا ڕادەخوشی، بەڵام ئەسپی تاتارەکانیش لە ئەسپەکەی ئەو نەدەمانەوە و وەک باوبۆران بە دوویدا دەهاتن. ویستی بۆ دواوە بگەڕێتەوە و سەری ئەسپەکە وەرسووڕێنێ بەڵام تێگەیشت خێراییەکەی هێندە زۆرە کە وەرسووڕاندنی سانا نییە و زۆریش ئەستەمە. لەگەڵ ئەوەشدا دیتی تاتارەکان زۆری لێنزیک بوونەتەوە. یەکێک لە تاتارەکان کە ڕیشێکی سووری هەبوو و بە سواری ئەسپێکی شێ لە پێش هەمووانەوە غاری دەدا بە ڕق و تووڕەییەوە لێوی خۆی گەست و تفەنگەکەی بۆ تەقە کردن ئامادە کردبوو.

ژیلین لە ژێر لێوەوە گوتی: «ئێوەی شەیتان زۆر باش دەناسم. ئەگەر بە زیندوویی بکەومە دەستتان دەمخەنە سیاچاڵەوە و بە قامچی هەموو پێستی لەش و کاسەسەرم دەگوروێنن، کەوایە هەرچۆنێکە دەبێ خۆم دەرباز بکەم و بە زیندوویی خۆم بە دەستەوە نادەم...»

بەڵام ژیلین پیاوێکی خڕیلانە و توندوتۆڵ بوو، زۆر گورج و شارەزایانە شمشێرەکەی لە کالان دەرکێشا و لەگەڵ ئەوەی ئەسپەکەی وەک باوبۆران دەفڕی، هێرشی بۆ تاتاری ڕیش‌سوور برد. دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی: «یان تۆ من و ئەسپەکەم دەکووژی، یان من بەو شمشێرە تۆ دەکەم بە دوو کوتەوە.»

چەند گوللەیان تەقاند و خوداوڕاستان گوللەیەک بەر ئەسپەکەی کەوت و ئەسپەکەی ژیلین بە توندی گلا و لەسەر زەوی تخێڵ بوو.



ژیلینش کەوتە ژێر ئەسپەکە و لەگەڵ ئەوەی لاقێکی کەوتبووە ژێر ئەسپە فیلەتەنەکە و بریندار بووبوو و نەیدەتوانی دەریکێشێ.

ژیلین بۆ دوایینجار هەوڵیدا لاقی خۆی لە ژێر ئەسپەکە دەرکێشێ و هەستێتە سەرپێ، کە دوو کەس لە تاتارەکان گەیشتنە سەری و خۆیاندا بە سەریدا و هەردوو دەستییان لە پشتەوە شەتەکدا. کڵاو و جزمەکانیان لە پێ داکەند و بە وردی گیرفان و باخەڵی گەڕان، کاتژمێر و پارەکانیان لێساند و ئەوی جلوبەرگی لەبەریدا بوو شەقوشڕیان کرد. ژیلین چاوێکی لە پشتسەری خۆی کرد و ئەسپە خۆشبەز و چالاکەکەی خۆی دی کە لەسەر لاتەنیشت کەوتبوو و بێئەوەی لاقەفرتێ بکات و هەوڵ بدات بۆ هەستانەوە، کونێک لەسەر تەختی نێوچاوانی بوو و خوێن لەوێوە فیچقەی دەکرد و هەتا مەترێکی دەوری خۆی بە خوێن سوور کردبوو و خەریکبوو دوایین هەناسەی دەکێشا و لە حاڵی گیانکەنشتدا بوو.

ئەسپەکە ئیتر هێزی لێبڕا بوو کە تاتارێک بە هەڵەداوان هات، زینی ئەسپەکەی لێکردەوە و خەنجەرەکەی لە کالان دەرکێشا و بێبەزەییانە و زۆر بە دڵڕەقی گەرووی ئەسپە بەستەزمانەکەی هەڵبڕی و ئاژەڵی بەستەزمان دوای ماوەیەک هەوڵ و لاقەفرتێ گیانی دەرچوو.

تاتاری ڕیش‌سوور سواری ئەسپەکەی خۆی بوو و تاتارێکیتر ژیلینی لە پاشتەرکی ڕیش‌سوورەوە سوار کرد و بۆ ئەوەی نەکەوێ توندوتۆڵ بە نێوقەدی تاتاری ڕیش‌سوورییەوە بەست و هەموویان بەرەو کێوەکان تێهەڵگەڕان.

ژیلین بێئیختیار لەسەر ئەسپەکە هەڵتەکهەڵتەکی دەکرد و بۆنی ناخۆشی لەشی تاتارە ڕیش‌سوورەکەی هەڵدەمژی و لەگەڵ ئەوەدا کە سینگی بە پشتی تاتارەکەوە نووسابوو هەستی بە هێز و گوڕی ئەو پیاوە بێڕەحمە دەکرد و چاوی لە پشت ملی و قژە ناڕێک و زبرەکەی دەکرد کە لە ژێر کڵاوەکەیەوە هاتبووە دەرێ. ژیلین بە زەبری قۆنداخە تفەنگ سەری لە چەند جێگاوە شکابوو و خوێن بە لامل و دەموچاویدا دەهاتە خوارێ و وەکوو پەردەیەک بەرچاوی تەنیبوو، بەڵام چونکە دەستی توند شەتەک درابوون نەیدەتوانی خوێنی سەر برژانگ و برۆی بسڕێ و خەریکبوون بە قژ و برژانگ و مژۆڵیەوە ڕەقیتەی دەبەست، هەستی دەکرد سات‌بەسات بە هۆی شەتەکدرانەوە ئێسکی دەستی خەریکە دەشکێن و دەمارەکانی دەپچڕێن.

دوای ئەوەی ماوەیەک ڕێیان بڕی، لە کێوێکەوە بە کێوێکی دیکەدا وەسەر کەوتن و پاشان بەودیوی کێوەکەدا داگەڕان و لە چۆمێک پەڕینەوە و گەیشتنە سەر ڕێگایەکی تەخت و تەکووز.

ژیلین دەیویست ئەو ڕێگایانەی پێیدا دەڕوا بە نیشانەگەلێک دیاری بکات، بەڵام خوێنی قەتماخە بەستووی سەر چاو و مژۆڵی نەیدەهێشت هیچکوێ ببینێ و لە لایەکی‌تریشەوە نەیدەتوانی ملی وەرسووڕێنێ. وردەوردە خەریکبوو هەوا تاریک دادەهات، ئەوان دیسان لە چۆمێکی دیکە پەڕینەوە، پاشان بە کێوێکی دیکەدا هەڵزنان و کاتێک لە گوند نزیک دەبوونەوە ژیلین هەستی بە بۆنی دووکەڵ کرد و چەقولووری سەگەلی بیست. دوای ماوەیەک گەیشتنە نێو



گوندەکە و لە ئەسپەکان دابەزین. منداڵانی تاتار دەوری ژیلینیان دا و دەستیان‌کرد بە هات‌وهاوار و زەنازەنا و دەربڕینی هەستی شادی و بۆ ئەوەی زیاتر هەست بە شادی بکەن ژیلینیان دایە بەرد و کەیفیان بەو ڕابواردن و بەردەفڕکێیە دەکرد.

پاشان تاتارێک بڵاوەی بە منداڵان کرد و ژیلینی لە ئەسپەکە دابەزاند و تاتارێکی بەهێز و قایم‌وقۆڵ و کەڵەگەتی بانگکرد و فەرمانێکی پێدا و ئەو تاتارە زەلام و فەرمان پێدراوە کە سینگی پان‌وپۆڕی لە کراسە کۆن و دڕاوەکەی وەدیار کەوتبوو دوای وەرگرتنی فەرمان لەوشوێنە دوور کەوتەوە. زۆری نەخایاند ژیلین دیتی کابرای ڕاسپێردراو بە دوو کۆلکە داری بەڕوو و قوڵف و قەڕازەی ئاسنین و کۆت‌وبەندەوە هاتەوە.

پاشان دەست و لاقی ژیلینیان کردەوە و ئەڵقەیەکی درێژۆکەیان لە دەست و لاقی کرد و بردیان بۆ هەمارێکی گەوڕ شێوە و درگایان لەسەر گاڵەدا. کە پاڵیان پێوەنا و خستیانە ژووری، ژیلین کەوت بە زەویدا و کە دەستی لە تەرکی دیوەکە درا، تێگەیشت پڕ لە پەینوپاڵە. خۆی لەگەزدا و لە سەر پەینوپاڵەکە لە تاوی ژانی جەستەی و کوتران و شەکەتی لەو تاریکییەدا بێئیختیار کەوت و خەیاڵ هەڵیگرت.

## (٢)

ئەو شەوە ژیلین بۆ ساتێکیش خەوی لێنەکەوت. شەوگار کورت بوون و زوو تێدەپەڕین و تازە خەریکبوو خەو دەچووە چاوی بۆی دەرکەوت بوومەلێڵی بەیانییە و هەستا سەرپێ و دەستیکرد بە گەورەکردنەوەی ئەو کونەی دیواری بەندەکە. دوای دەستهەڵگرتن لەو کارە چاوی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا و لە هەموو بارێکەوە لێکیدایەوە.

چاوی بە تووڵەڕێیەک کەوت کە بە تیرشانی کێوەکەوە دیاربوو. هەر لەوکاتەدا ماڵێکی دی کە تاتارێک لەلای ڕاستی دیوارەکەی ڕاوەستابوو. لەبەر ماڵەکەش دوو پیرەداری لێبوو و سەگێکی ڕەش لە بن دارێکیان وەرکەوتبوو. هێندێک لەولاتریشەوە بزنێک و چەند کاژیلەی چاو پێکەوت دەلەوەڕان و کلکە قوڵەکەیان دەجووڵاندەوە. ژیلین بە وردی و بە شێوەیەکی هەستیار هەموو ئەو بارودۆخەی هێنایە بەرچاوی خۆی و پاشان کچێکی شۆخوشەنگ سەرنجی ڕاکێشا کە کراسێکی گوڵدار و پانتۆڵێکی ڕەنگاوڕەنگی لەبەردا و جووتێ چەکمەی ئاسایی لە پێدا بوو. لەچکەیەکی تەنکی دابوو بە سەریدا و دەبەیەکی مسینی لە سەر سەری دانابوو و بەرەو لایەک دەڕۆیشت و دەستی منداڵێکی تاتاری گرتبوو کە تووکەسەری لە بندا تاشرابوو؛ خۆیکرد بە ماڵێکدا کە لە پێشدا وەسفمان کرد. کاتێک کە ئەو کچە دەهاتە ژوورێ، تاتارە ڕیشسوورەکە خەریکبوو لەو ماڵە



دەچووە دەرێ. ئەو پیاوە تاتارە کراسێکی هەورێشمینی لەبەردا بوو و کڵاوێکی پێستە مەڕی لەسەر نابوو و خەنجەرێکی زێوینی بە نێوقەدیدا هەڵواسیبوو، ئەو بە پێخاوسی هەنگاوی دەنا و لەگەڵ ئەوەشدا کڵاوێکی لەسەر نابوو کە لە دوو لاوە لێوارەکەی داچۆڕابوو، کە دیار بوو خۆی چاوپۆشی لەو گوێپۆشە شاراوانە کردبوو.

بە دەم ڕێگاوە پشتی دەستی خۆی بە ڕیشە خەنەیییەکەیدا دەهێنا و هەروا ڕێگای دەبڕی. ئەو بە شێوەیەکی کتوپڕ بۆ خۆخڵافاندن ڕاوەستا و زۆر تووڕە و تۆسنانە فەرمانی بە کرێکارێک دا و لەو شوێنە دوور کەوتەوە.

دوو ئەسپ کە دوو مێرمنداڵ سواریان بووبوون و دەیانبردن ئاویان بدەن، کەوتبوونە هەناسەبڕکێ و شەکەت و ماندوو یاڵ و لامل و بەرزگیان لە ئارەقەدا خووسابوو. بەدوای ئەسپەکاندا چەند منداڵی دیکەش کە تەنیا یەکی کراسێکیان لەبەردا بوو بە هەڵاتن دەهاتن و کە گەیشتنە بەر گەورەکە بە شێوەیەکی بازنەیی ڕیزیان بەست. هێندێکیان دەستیان دا شووڵ و چیلکەی باریک و دەیانکرد بە کونی گەورەکەدا. ژیلین لە نێو گەورەکەوە هاواری لێهەستا و منداڵەکان تۆقیوانە پێیان پێوەنا و هەڵاتن. کاتێک هەڵدەهاتن چۆکیان لە ژێر ئاتەکی کراسە قوڵەکانیانەوە وەدیار دەکەوت.

ژیلین زۆری توونی بوو، جگە لە ئاو بیری لە هیچ شتێکی دیکە نەدەکردەوە، لەوانەبوو سیوشکەی هەڵێ. گەرووی وشک وشک بووبوو. ئاخری بەخۆی گوت: «لانیکەم بۆ ئاگادار بوون لەو دۆخە

نالەبار و تاڵەم سەرێکم لێهەڵێنن و چۆڕێک ئاوم بدەنێ!» لەو کاتەدا دیتی دەرگای هەمارەکە کرایەوە و تاتاری ڕیشخەنەیی هاتە ژوورێ و تاتارێکی خڕیلانەی ڕەشتاڵە بە چاوانی ڕەش و زیت و ڕیشێکی تۆپەوە بە دوایدا هات. تاتاری ڕەشتاڵە ڕوخسارێکی بزەتێزاو و شادی هەبوو، کراسێکی شینی هەورێشمینی پەراوێزگیراوی لەبەردا و خەنجەرێکی گەورەی زێوینی بە نێوقەدیدا هەڵواسیبوو. جووتێ کەوشی سووری لە پێستی کاژیلەی لە پێدا بوو کە بە دەزووی تایبەت ڕازابۆوە و کڵاوێکی سپی و درێژۆکەی لەسەر نابوو.

تاتاری ڕیشخەنەیی هاتە ژوورێ و تووڕە و دەخەزدارانە دەستیکرد بە دەربڕینی وشەی ڕەق و دانەدانە و لە ژێر چاوییەوە وای چاو لە ژیلین دەکرد کە دەتگوت گورگی برسییە و لە بەرخێک ڕیچ بۆتەوە و بەردەوام دەستی بە خەنجەرەکەیدا دەهێنا و ئەمبارەوباری دەکرد. بەڵام تاتاری ڕەشتاڵە بە پێچەوانەی تاتاری ڕیشخەنەیی زۆر بە پرتاو چووە پێشێ و بە توندی دانی بەسەر یەکدا نا و لە ژیلین نزیک بۆوە، بە توندی شانی ژیلینی گرت و لەژێر لێوەوە بۆڵەبۆڵێکی لێوەهات و مەعلووم نەبوو چی دەڵێ، چاوانی گڕی شەیتانی و دڵڕەقییان لێدەباری و ئاخری دوای هەوڵێکی زۆر گوتی:

– دەی عورووس! دەی عورووس!

بەڵام ژیلین سەری لە قسەکانی دەرنەچوو و گوتی:

– من توونیمە، چۆڕێ ئاوم بدەنێ.

تاتاری ڕەشتاڵە بزەیەک نیشتە سەر لێوی و بە ڕق و قینێکی شەیتانانەوە دووپاتی کردەوە:



– عورووس چاکە. عورووس چاکە.

ژیلین بە لێو و دەستی وایئنواند کە زۆری توونییە و دەبێ ئاوی بدەنێ.

تاتاری ڕەشتاڵە ئاخری لێیتێگەیشت و دوای کێشانی قاقایەک سەری لە دەرگاکە بردە دەرێ و هەرای کرد:

– هۆی کچێ!

دینا کچێکی سێزدە ساڵان و ناسک و کز و بەژن زراو بە ڕوخساری ئەسمەر و ڕوومەتی پان و چاوی ڕەش و گەشەوە بە هەڵەداوان هات بۆ لای کابرای تاتار، کچۆڵەیەکی شۆخوشەنگ و ناسک بوو، سەرگۆنای سوور تا ڕادەیەک تاوەسووت، کراسێکی شینی ئاسمانی لەبەردا بوو کە قۆڵەکانی فشوفۆڵ و بەبێ کەمەرە بوو، سەردەست و دەوری ملیوانەکەیان بە زەڕی و قردیلەی سوور بۆ ڕازاندبۆوە. پانتۆڵێکی کۆن و چرچولۆچ و جووتێ کەوشی ناشیرینی لە پێدا بوو. بەجێی خەناوکە چەند دراوی قەڵبیان کون کردبوو لە ملی کچۆڵەیان کردبوو. سەری ڕووت و بێلەچکە و پەلکە درێژەکانی بە قردێلە و دراوی قەڵبی ڕووسی بۆ ڕازاندبۆوە.

باوکی شتێکی پێگوت.

کچە بە هەڵەداوان دوور کەوتەوە و دوای تاوێک بە دۆلکەیەکی تەنەکەوە کە پڕ بوو لە ئاو گەڕایەوە. کاتێک کچە ئاوەکەی دایەدەست ژیلین، لەسەر چۆک بەرەوڕووی ژیلین دانیشت چاوی لە ئاوخواردنەوەکەی بڕی. بەجۆرێک چاوی لە ژیلین بڕیبوو کە دەتگوت

چاو لە ئاژەڵێک دەکات. کچە بە شێوەیەک دانیشتبوو کە شانە کز و ڕەقەکانی دەرپەڕیبوو.

ژیلین دوای خواردنەوەی ئاوەکە دۆلکەکەی دایەوە دەست کچەکە. بەڵام کچە لە ترسانا و تۆقیوانە وەها داچڵەکی و وەکوو کارمامزێکی کێوی دەرپەڕی و کشایە دواوە کە باوکی بە دیتنی ئەو ترسانە کتوپڕەی کچەکەی زەردەیەکی گرت و دیسان کچەی بۆ شوێنێکی نامەعلووم نارد. کچە دۆلکەکەی وەرگرت و تێی‌تەقاند، دوای تاوێک بە هێندێک نانەوە کە لەسەر تەختەیەکی دانابوو گەڕایەوە و لەبەر دەمی ژیلین دانیشت و دیسان چاوی تێبڕی و هەروا تێی‌ڕاما بوو.

تاتارەکان ڕۆیشتن و دەرگاکەیان لەسەر ژیلین داخست.

دوای ماوەیەکی کورت تاتارێک کە زمانی ڕووسی نەدەزانی هاتە پشت دەرگاکە و بە ژیلینی گوت:

– ئەها ئەرباب، ئەها ئەرباب.

ژیلین هیچی لێ‌تێ‌نەگەیی، تاتار دەرگاکەی کردەوە و بە ئیما و ئاماژە تێی‌گەیاند کە هەستێ و دەبێ بچن بۆ شوێنێک.

ژیلین کە کۆتوبەندی لە لاق کرابوو و نەیدەتوانی بە شێوەی ئاسایی هەنگاو هەڵبێنێتەوە بە شەلەشەل و هەڵتەک هەڵتەک بە دوایدا دەڕۆیشت.

لاق و قولاپەی کوترابوون و زۆری ئازار دەدا. دوای ئەوەی بە دوای تاتارەکەدا لە هەمارەکە هاتە دەرێ چاوێکی لە دەوروپشتی خۆی کرد و بۆی دەرکەوت کە لە گوندی تاتارەکان دەسبەسەر کراوە، ئەویش گوندێک کە لە چەند ماڵ و مزگەوتێک و چەند



گومبەزی پێکهاتبوو. لەبەر درگای ماڵێک سێ ئەسپ ئامادە و زین‌کراو ڕاگیرابوون کە منداڵی تاتارەکان هەوسارەکانیان گرتبوون. ژیلین چاوی بە تاتاری ڕەشتاڵە کەوت کە بە چاوی زەق و تووڕەوە لە ماڵەکە هاتە دەرێ و بە ئاماژەی دەست ژیلینی بۆ لای خۆی بانگ کرد. تاتارەکەی دیکە بەردەوام پێدەکەنی و قسەی دەکرد بەڵام ژیلین لە قسەکانی تێ‌نەدەگەیشت، دیسان خۆی کردەوە بە نێو ماڵەکەدا و ژیلینیش بە دوایدا چووە دەرێ. ژیلین پێی نایە وەتاغێکەوە کە دیوارەکانی قوڕەسواخ بوو و لای ژووروویی دیوەکە بە پشتی و بالیف و دەستەنوێن و دۆشەکی ئەستوور ڕازابۆوە و دیوارەکانی قاڵیچەی گرانبایی و تفەنگ و دەمانچە و خەنجەری کالان و مشتوو زێوینی پێدا هەڵواسرابوو، لە لایەکی دیوارەکە کۆماج هەڵکەوتبوو، کە هێشتا خۆڵەمێشی زستانی تێدا مابوو، تەرکی ژوورەکەش کە بە کاگڵ سوواخ درابوو، لباد و بەڕەی لێ‌ڕاخرابوو و لەسەر ئەوانیشەوە فەرش و مافوورەی گرانبایی و جوان و نەخشین ڕاخرابوون و تاتارەکان بە پای پەتی لەسەری دانیشتبوون کە بریتی بوون لە تاتاری ڕیشخەنەیی و تاتاری ڕەشتاڵە و سێ کەسی دیکە کە وێدەچوو میوان بن. ئەوان هەموو پاڵیان بە دەستەنوێن و پاڵەوپشتەکانەوە دابوو و بە قامکە زبر و خواروخێچەکانیان پاروویان دەگرت و ڕۆن بە چنگ و پلیاندا دەهاتە خوارێ و لەسەر موجعمەیەک کە پڕبوو لە نان و نۆشک و بیرەی تایبەتی تاتاری خەریکی زگ لەوەڕاندن بوون و تامەزرۆیانە گووپیان بادەدا و پارووی گەورە گەورەیان هەڵمەقووت دەکرد.

تاتاری ڕەشتاڵە هەستا سەر پێ و دەستووریدا کە ژیلین لە سووچێک هەڵبەت نەک لەسەر فەرشەکە دابنیشێن. دیسان خۆی چووە سەرفەرشەکە ڕاوەستا و دەستی کردەوە بە میوانداریکردن لە تاتارەکان.

کرێکارێک کە ژیلینی لە هەمارە گەوڕ شێوەکەوە هێنابوو کەوشەکانی لە پێی خۆی داکەند و لەلای کەرکەرۆکەی درگاکەوە و لە ڕیزی کەوشەکانی دیکەدا جووتی کردن و بێئەوەی کات بەفیرۆ بدات چوو لە پاڵ ئەربابەکەیدا دانیشت. ژیلین بە دیتنی ئەو خواردنە خۆش و بەتامانە دەمی ئاوی کرد و تامەزرۆیانە چاوی لە موجعمەکە بڕیبوو.

دوای ئەوەی تاتارەکان نانی نیوەڕۆیان خوارد ژنی خاوەنماڵ کە کراسێکی تایبەتی لەبەردا بوو پەڕۆیەکی لەچکەشێوەی بە سەریدا دابوو هاتە ژوورێ و دوای ئەوەی نان و پێخۆر و موجعمەکەی کۆ کردەوە لەچکەکەی سەری ڕاستەوپاستە کرد و بە لوولێنەیەکی ملباریک لەسەر تیانەیەک دانە دانە ئاوی بە دەستی میوانەکاندا کرد و دوای ئەوەی هەموویان دەستیان شۆرد بە نیشانەی شوکرانەبژێری دەستیان بەرز کردەوە و بە شێوەی ڕەسمی شوکرانەبژێرییان بەجێ هێنا. پاشان یەکێک لە میوانەکان لەگەڵ ئەوەی چاوی لە ژیلین بڕیبوو بە زمانی ڕووسی دەستیکرد بە قسە کردن و گوتی:

– من ئاگادارم کە قازی محەممەد تۆی بە دیل گرتووە ـ لەگەڵ ئەوەی بە قامکی ئاماژەی بە تاتاری ڕیشخەنەیی دەکرد ـ



گوتیشی: قازی محەممەدیش تۆی بە عەبدولمراد ـ کە تاتارە ڕەشتاڵەکە بوو ـ فرۆشتووە و کەوایە ئێستا ئەرباب و بژێودەری تۆ عەبدولمرادە.

ژیلین هەروا بێدەنگ بوو و متەقی نەدەکرد. عەبدولمراد لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە ژیلین دەکرد و پێدەکەنی دەستیکرد بە قسەکردن و گوتی:

– سەربازی ڕووس، زۆر چاکە سەربازی ڕووس.

دیلمانج گوتی:

– ئەو دەستوورت پێدەدا کە نامەیەک بۆ ماڵی خۆتان بنووسی و داوای پارە بکەی، چونکە بە پارە ئازادت دەکا و هەر لەگەڵ گەیشتنی پارەکە و وەرگرتنی دەستبەجێ ئازادت دەکات.

ژیلین دوای تۆزێ بیرکردنەوە گوتی:

– یانی بەڕاستی ئەو داوای پارەیەکی زۆرم لێدەکات؟

دیلمانج و تاتار پێکەوە سرتوخورتێکیان کرد. دیلمانج گوتی:

– سێهەزار سککە.

ژیلین هاواری لێهەستا: نا، من قەت ئەو پارە زۆرەم پێنادرێ و دانی ئەو هەموو پارەیە لە توانای مندا نییە.

عەبدولمراد کە پێیوابوو ژیلین لە هەموو قسەکانی گەیشتووە هەستا سەرپێ، لەپی دەستی لەیەک هەڵساوی و بە زمانی تاتاری و بە دەنگێکی بەرز کەوتە ئاخافتن.

دوای قسەکانی عەبدولمراد دیلمانج پرسیاری لە ژیلین کرد:

– دەی تۆ چەندەت پارە بۆ هەڵدەسووڕێ بیدەی؟

ژیلین دوای گتگرتنێک گوتی:

– پێنجسەد ڕوبڵ.

تاتارەکان دەستیانکرد بە قسەکردن و عەبدولمراد کە ڕووی قسەی لە ڕیشخەنەیی بوو گوڕاندی بە سەریدا و کەفی هەڵخڕاند و لەگەڵ قسەکردنەکەی ئاوی دەمی دەپرژاند و نەڕە و گوڕەی وەڕێخستبوو.

ڕیشخەنەیی کە نێوچاوانی گرژ بووبوو لە بن لێوەوە منجاندی.

سەرنجی دیلمانج هەمووانی بێدەنگ کرد، پاشان ڕووی لە ژیلین کرد و گوتی:

– پێنجسەد ڕۆبڵ هەر پارە نییە، ئەوە زۆر کەمە. ئەرباب تۆی بە نزیکەی دووسەد ڕۆبڵ لە ڕیشخەنەیی کڕیوە و قازی محەممەدیش ئەو بڕە پارەیە بە عەبدولمراد قەرزدارە و ئەویش تۆی لەباتی ئەو قەرزە پێداوە. کەوابێ لە سێهەزار ڕۆبل کەمتر ناگونجێ. بۆیە جوان گوێبگرە، ئەگەر نامەیەک بۆ بنەماڵەکەت نەنووسی و داوای ئەو بڕە پارەیە نەکەی ئەوە دڵنیابە جێگات کونەڕەش دەبێ و لەوێدا قامچی و لێدان و ئەشکەنجە بەپێی فیلانە و وا چاکە خۆت بۆ نۆشیگیان کردنی ئەو ئەشکەنجە و زەبرانە ئامادە بکەی. چونکە زۆر باشت خوریشۆر دەکەن.

ژیلین خەیاڵ هەڵیگرت و دوای تۆزە گتگرتنێک گوتی: «تووشی چ گێچەڵێک بووم، وادیارە دۆخەکە جار لەگەڵ جار خراپتر دەبێ.»

بە پڕتاو و بە تووڕەیی هەستا سەرپێ و گوڕاندی:



– تۆ بەو سەگە کەلاکخۆرە بڵێ ئەگەر هەڵیشمواسێ کاپکێکی وەگیر ناکەوێ و نە نامە دەنووسم و نە داوای پارەش دەکەم بۆم بنێرن، من لەوەتا دەژیم لە هیچ شتێک نەترساوم و لەمە بەدواوەش ترسم نابێ و ئەو سەگەلە گەڕ و خوێڕییانە بە هیچ نازانم.

دیلمانج قسەکانی ژیلینی بۆ تاتارەکان دووپات کردەوە.

ماوەیەک تاتارەکان کەوتنە دەمەتەقێ و مشتومڕ و دوای چەند ساتێک تاتاری ڕەشتاڵە هەستا سەرپێ و شاد و لێو بەبزە لە ژیلین نزیک بۆوە و گوتی:

– عورووس، جیگیت، جیگیت، عورووس[١]!

«جیکیت بە زاراوەی ئەوان یانی لاوی بەجەرگ و ئازا» لە پەستا قاقای دەکێشا و شتێکی بە دیلمانج دەگوت.

پاشان ڕووی لە دیلمانج کرد و ئەویش ئەوەی کابرای ڕەشتاڵە پێیگوتبوو بۆ ژیلینی دووپات کردەوە.

– باشە هەزار ڕۆبڵ بدە.

ژیلین پێداگریی لەسەر وتەکانی خۆی کرد و خیشەسەرانە گوتی:

– لە پێنجسەد ڕۆبڵ زیاترم نییە و ئەگەر بشمکوژن لەوە زیاترم نییە و بۆم هەڵناسووڕێ.

تاتارەکان جارێکی دیکە کەوتنەوە مشتومڕ و لەوبارەوە کەوتنە بیرورا گۆڕینەوە و دوای ساتێک ئەو کرێکارەی کە ژیلینی هێنابوو

١- Orrusse یانی ڕووی بە زاراوەی ڕۆژهەلاتییەکان

ناردیان بۆ جێگایەک و تاوێک چاویان لە ژیلین دەکرد و تاوێک لە دەرگاکە. کرێکارەکە هاتەوە بەڵام بە تەنیا نەبوو، بەڵکوو پیاوێکی تەژە و قەڵەوەی لەگەڵدا بوو کە بە پێخاوسی و کراسێکی شڕەوە هاتە ژووری کە ئەویش وەک ژیلین کۆت و بەندی لە پێدا بوو.

ژیلین بە دڵێکی خەمناک و بە سۆزەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا، کاستیلینی ناسییەوە و تێگەیشت کە ئەویشیان بە دیل گرتووە. هەردووکیان لە پاڵ یەکتردا دانیشاندن. ئەوان چۆنیەتیی دەستبەسەر بوونەکەی خۆیان بۆ یەکتری گێڕایەوە. تاتارەکان متەقیان لە خۆیان بڕیبوو و لەو دوو دیلە داماوە ڕامابوون. ژیلین هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ کاستیلین باس کرد و کاستیلینیش چۆنیەتیی گیران و دەستبەسەرکرانی خۆی بە وردی بۆ ژیلین گێڕایەوە: «ئەو ئەسپەی کە لە ژێر پێمدا بوو بە دیتنی ئەو دیمەنە لە جێی خۆی وشک بوو و بەبێ ئەوەی تەقە لە تفەنگیانەوە بێ وەک دەڵێن گورزی خۆیان وەشاند و ئەم عەبدولە هەڵیکوتا سەرم و بە دیلی گرتم.»

عەبدول هەستا سەرپێ، لەگەڵ ئەوەی چاوی لە کاستیلین بڕیبوو شتێکی بە دیلمانجەکەی گوت و ئەویش وتەکەی ئەوی دووپات کردەوە.

– ئێستا ئێوە هەردووکتان ئەربابێک خاوەنتانە و هەرکامێکتان زووتر پارەکەی بۆ بێنێ زووتر ڕزگار دەبێ و کۆتوبەندی دیلیەتی لە پێ دادەماڵدرێ.

پاشان دیلمانج بە ژیلینی گوت:



– تۆ وێدەچێ مرۆڤێکی کەمجیکەڵدانە بی و بە کەوچکە ئاوێک دەکەویتە مەلە، بەڵام هاوڕێکەت بە پێچەوانەی تۆ زۆر ئارام و لەسەرەخۆیە. چونکە لەڕێوە نامەیەکی بۆ بنەماڵەکەی نووسی و داوای پێنجهەزار ڕۆبڵی کرد. هەر بۆیە بە دڵی خۆی خواردنی خۆش و بەتامیان پێداوە و هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەکیش بۆ ئەو لە گۆڕێدا نییە.

ژیلین لە وەڵامدا گوتی:

– هاوڕێکەم هەر کارێک بکات پێوەندیی بە خۆیەوە هەیە و من خۆم بە ئاوری ئەو ناسووتێنم. ڕەنگە ئەو پیاوێکی دەوڵەمەند و زەنگین بێ، بەڵام خۆم ئاگام لە ماڵ و سامانی خۆم هەیە و پارەیەکی ئەوتۆم نییە و بۆم جێبەجێ ناکرێ. من ئەوەی پێمگوتن هەر ئەوەیە و تەواو. ئەگەر حەز دەکەن بمکوژن، من هیچ دەسەڵاتێکم نییە و خۆتان چۆنتان پێخۆشە وا بکەن. ئەوەش بزانن بەو کارە هیچ شتێکتان وەگیر ناکەوێ. من نامەکە دەنووسم بەڵام لە پێنجسەد ڕۆبڵ زیاتر ناتوانم بنووسم.

تاتارەکان متەقیان لە خۆیان بڕیبوو. لە ناکاو عەبدول لە جێی خۆی هەستا و بەپەلە لەسەر تاقەکە مجریی کاغەز و جەوهەری هەڵگرت و قەڵەمی دایە دەست ژیلین و گوتی: بنووسە، ڕازیم، پێنجسەد ڕۆبڵەکە بنووسە.

ژیلین ڕووی لە دیلمانجەکە کرد و گوتی:

– پێیبڵێ لانیکەم تۆزێ سەبوور بێت و سەرنج بداتە وتەکانی من، داوای لێبکە هێندێ ئاگای لێمانبێت و خواردنمان بداتێ و

کەوش و جلوبەرگمان بۆ دابین بکات و ودم بدات هەردووکمان لەلای یەکتر بین. چونکە ئێمە لەلای یەکتر دڵخۆشتر دەبین، تکایە ئەم کۆت و زنجیرانەش لە لاقمان بکەنەوە.

ژیلین چاوی لە ئەرباب کرد و پێکەنی، ئەربابیش بە بیستنی قسەکانی ژیلین پێکەنی و دوای بیستنی ئەو وتانە گوتی:

– من باشترین جلوبەرگی تاتاری و تەنانەت جزمەی چرکسیتان پێدەدەم تەنانەت ئەگەر بڕیار بدەی ژیانی هاوبەشیش پێکبێنی، لەلایەن منەوە دڵنیابە و هیچ دژایەتییەکەم نییە. بۆ خورد و خۆراکیش خەمتان نەبێ، وەکوو شازادەیەک میوانداریتان لێدەکەین، تەنانەت ئەگەر بتانهەوێ لەلای یەکتر بن و بەو هەمارە ڕازی نەبن من قسەم نییە و دەستوور دەدەم ژوورێکی باشتان بدەنێ. بەڵام بە هیچ جۆرێک ئەو کۆت و زنجیرانەتان لە لاق ناکەمەوە، چونکە دەترسم خەیاڵی دەربازبوون لە کەللەتان بدات و هەڵێن. تەنیا دەتوانم شەوانە کاتی خەو قفڵ و زنجیرەکانتان لە لاق بکەمەوە.

هەستا سەرپێ و بە ئاکارێکی تەواو ساختە و فێڵەبازانەوە دەستی نایە سەرشانی ژیلین و گوتی:

ـ تۆ باش بی منیش باشم!

ژیلین نامەکەی نووسی بەڵام جۆرێکی نووسی کە هیوای شادبوونەوە بە ماڵ و خێزانی نییە و لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە. «حەتمەن دەبێ هەڵێم.»



ژیلین و کاستیلین ڕێنوێنی کران بۆ لای گەوڕەکە و هێندێکیان کای گەرمەشانی بۆ ڕۆ کردن و گۆزەیەک ئاو و دووسێ نان و دوو قات جلی کۆنی چرکسی و دوو جووت چەکمەی سەربازییان بۆ دانان. وێدەچوو ئەو چەکمانە هی سەربازە کووژراوەکان بن، شەوێ قوفڵ و زنجیرەکانیان لە لاقیان کردەوە و وەک هەمیشە دەرگای گەوڕەکەیان لەسەر گاڵەدان و ڕۆیشتن.

## (٣)

ژیلین بۆ ماوەی مانگێک لەگەڵ هاورێکەی خۆی درێژەی بە ژیانێکی یەکهاوی‌دا. ئەربابەکەشی بەدەوام پێدەکەنی و دەیگوت : «ئیڤان تۆ باشی، عەبدول، منیش باش.» (ئیڤان ناوێکی‌تری ژیلین بوو.)

بەڵام عەبدول بە پێی ئەو بەڵێنانەی پێشووی کە پێی‌دابوون خواردنی باش و بەتامی نەدەدانێ و تەنیا یەکی نانێکی پێ‌دەدان کە ئاردەکەی بۆر و پڕ لە سۆست بوو، هەویرەکەشی جوان هەڵنەهاتبوو بۆیە نانەکە جیڕ و فەتیر بوو.

کاستیلین بۆ دەربازبوون لەو تەنگژەیە دیسانیش نامەی بۆ کەس‌وکارەکەی نووسی و چاوەڕێ بوو پارەی بۆ بنێرن و خەم و خەفەت تەنگی بە ڕۆحی هەڵچنیبوو. شەو و ڕۆژ لەو هەمارەدا دادەنیشت و ڕۆژەکانی دەبژارد و بە گۆمی بیر و خەیاڵدا ڕۆدەچوو: «ئاخ خودایە گیان! ئەی کەنگێ نامەیەکی بنەماڵەکەمم بە دەست دەگا؟» زۆر جاریش بۆ دەربازبوون لە چنگ ئەو بارودۆخ و گرفتارییە تاڵە و سوکنایی‌هاتن پەنای بۆ خەو دەبرد. بەڵام ژیلین بە باشی ئاگادار بوو کە نامەکەی هیچکات ناگاتە دەستی بنەماڵەکەی و هەر بۆیە بە پێویستی نەدەزانی دیسان نامە بنووسێ. ئەو، پیاوانە و زۆر خۆڕاگرانە و خیشەسەرانە وەک کێو خۆی ڕاگرتبوو و بیری دەکردەوە:



«ئەگەر دایکم بڕیاریش بدات کە من لە چنگ ئەو بارودۆخە تاڵ و نالەبارە دەرباز بکات، خۆ هیچ پارە و سامانێکی بە دەستەوە نییە و بۆ بژیوی ڕۆژانە ئەوەی من پێمنەدایە هیچی‌تری نەبوو. ئەگەر ئەو پێنج‌سەد ڕۆبڵ بۆ ڕزگارکردنی من بنێرێ حاڵ و ژیانی خۆی بە جارێ شڕ دەبێ و دەکەوێتە سواڵ، بەڵام ئەگەر خودا یارمەتیم بدات حەتمەن و دڵنیام خۆم لەو بەند و تەنگژەیە دەرباز دەکەم.»

بەردەوام بیری لەو خۆدەربازکردنە دەکردەوە و پیلانی دادەڕشت کە چۆن هەڵێت و خۆی دەرباز بکات.

ئەو هەروا لەو بارودۆخە ناخۆش و دژوارە و لە نێو هەمارەکەدا پیاسەی دەکرد و فیتووی لێدەدا، هێندێ‌جار دادەنیشت و بڕێ‌جاریش خۆی بە دروستکردنی کەلوپەلی دەست‌سازەوە سەرقاڵ دەکرد و سەرەتا بووکەڵەی دروست دەکرد یان بە شووڵی شلک و ناسکی دار قەرتاڵە و قوڵینەی دەچنی، چونکە ژیلین بۆ دروستکردنی ئەو شتانە زۆر لێزان و دەست‌ڕەنگین بوو.

ڕۆژێک بە ڕێکەوت بووکەڵەیەکی زۆر جوانی دروست کرد کە دەست و لاق و دەمولووتی زۆر جوان و ڕێک‌وپێک بوو و لە مرۆڤی ڕاستەقینە دەچوو؛ کراسێکی تاتاریانەی لەبەر کرد و لەسەر سەربانەکە داینا.

لەو کاتەدا دەستەیەک ژنی تاتاری کە بەو شوێنەدا تێدەپەڕین و دەچوون بۆ ئاوهێنان لە کانی و دینای کچی ئەربابیش لەگەڵیاندا بوو، لەپڕ دەنگی هەڵبڕی و بە ژنەکانی گوت کە چاو لە بووکەڵەکە بکەن. هەموو ژنەکان بە دیتنی بووکەڵەکە دایان لە قاقای پێکەنین. ژیلین

بووکەڵەکەی هەڵگرت و بۆ ئەوەی زیاتریان شاد بکات بووکەڵەکەی پێدان و ژنەکان دیسان دەستیانکردەوە بە قریشکە و قاقاکێشان. بەڵام ژنەکان بووکەڵەکەیان لێوەرنەگرت و ژیلین بووکەڵەکەی لە نزیک هەمارەکە بەجێهێشت و خۆی گەڕایەوە بۆ نێو هەمارەکە و گوێقوڵاخ و لەسەر هەست بوو تاکوو بزانێ دەبێ بەچی؟

دینا دوای تاوێک بەپرتاو هەڵات بۆ لای بووکەڵەکە و دوای ئەوەی چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد بە چاوێکی وردبینانە و مووقەڵێشانەوە ڕوانیی، بووکەڵەکەی هەڵگرت و وەک بای شەماڵ بۆی دەرچوو.

بەرەبەیان کە تازە خۆر هەڵاتبوو و پرشنگی ڕێڕینی خۆی بەسەر وڵاتدا دەباراند دینا لە دەگانەی ماڵەکەیان هاتە دەرێ و بە زەوق و سەلیقەی کراس و پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگی لەبەر بووکەڵەکە کردبوو و متومووررووی وێخستوو و وەک منداڵی بەرمەمکان لە باوەشی کردبوو و بە زمانی خۆی لایەلایەی بۆ دەگوت و دەیلاواندەوە کە لەناکاو پیرێژنێک بە ناوچاوانێکی گرژ و بە تووڕەیی لەو ماڵە هاتە دەرێ و بە زمانێکی تاڵ و جنێودان بووکەڵەکەی لە دەستی دینا ڕاپسکاند و بێ بەزەییانە لەبەریەکی برد و هەر لەتەی بە لایەکدا فڕێدا و بە گوڕە و بۆڵەبۆڵ کچەی نارد بە دوای کارێکدا.

ژیلین دیسان دەستیکرد بە دروستکردنی بووکەڵەیەکیتر و ئەمەیان زۆر لەوی دیکە باشتر و جوانتر بوو و بە دیاری دای بە دینا. کچە زۆر شاد و دڵخۆش گۆزە ئاوەکەی لە شانی داگرت و



بەرەوڕووی ژیلین ڕاوەستا و لەگەڵ ئەوەی گۆزە ئاوەکەی نیشان دەدا شادی و زەردەخەنە لەسەر لێوانی هێلانەی کردبوو.

ژیلین لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە و دەیگوت: «ئاخر ئەوە دڵی بە چی خۆشە؟» گۆزەکەش کە کچە لەبەر دەمی دانابوو وایزانی ئاوی تێدایە و هەڵیگرت و نای بە سەریەوە بەڵام بۆی دەرکەوت گۆزەکە بەجێی ئاو شیری تێدایە و ژیلین بۆ سپاس و پێزانینی کاری کچە گوتی:

- زۆر چاکە.

ديناش بزەی هاتێ و دڵخۆشانە گوتی:

- باشە ئیڤان باشە!

کتوپڕ هەستا سەرپێ، گۆزەکەی لە ژیلین وەرگرت و بە هەڵەداوان لێی دوور کەوتەوە.

لەو ڕۆژەوە بە شێوەی نهێنی و دوور لە چاوی هەمووان شیری بۆ ژیلین دەهێنا. ئەو شیرەش شیری بزن بوو کە تاتارەکان دەیاندۆشی و لەو شیرە، ماست و دۆ و شتی دیکەیان دروست دەکرد و کەشکەکەشیان بۆ وشکبوونەوە لە سەربانەکە هەڵدەخست.

بۆیە کەشکەکانیش لە دەست دینا دەرنەدەچوون و بە دزییەوە دەیبردن بۆ ژیلین. کچە هێندە هۆگری ژیلین بووبوو، کە ڕۆژێک ئەوکاتەی ئەرباب مەڕێکی سەربڕی، دینا زۆر بە نهێنی گۆشتی لە ژێر کراسەکەیدا شاردەوە و خۆی گەیاندە لای ژیلین و خێرا و بەپەلە بۆی فڕێدا و هەڵات.

ڕۆژێک بە هۆی هەور و هەلا و برووسکە و هەورەگرمەوە هەوا لێڵ و تاریک داهات و بۆ ماوەی کاتژمێرێک بارانێکی بەخوڕ و سەربەکلاوە دایدا و دەتگوت گۆزەی سەرەوبنە و سێلاو هەستا و چۆمەکان نزیکەی سێ مەتر ئاوەکەیان هاتە سەرێ و ئاسمان بە شێوەیەکی تووڕە و دەغەزدارانە دەینالاند و سێلاوێک هەستابوو کە گابەردی دەتلاند و لەگەڵ قوڕ و لیتە و ئەرخەوان سوور ڕایدەدان و ئاسمان وەک شێرێکی برسی و دڕندە نەعرەتەی بەرز کردبۆوە و داروبەردی وەلەرزین خستبوو و نەعرەتەکەی لەگەڵ هاژە و لرفەی لافاوەکە تێکەڵ بووبوو و لە ناخی شاخ و ڕەوەزەکاندا دەبوو بە زایەڵە. ژیلین چەقۆیێک و هێندێک تەختەی لە ئەربابەکەی وەرگرت و بە تەختەکان دوو تایەی عارەبانەی دروست کرد و دوو بووکەڵەشی دروست کرد کە یەکیان جلوبەرگی پیاوانەی لەبەر کرد و دووهەمیش جلوبەرگی ژنانە و کاتێک تایەکان دەسووڕان بووکەڵەکان دەکەوتنە جووڵەجووڵ و هەڵبەزدابەز کردن. پاشان تایەکانی لەسەر ئاوی ئەو چۆمەڵە دانا کە لەو نزیکانە هەڵکەوتبوو و کاتێک ئاوەکە لە تایەکانی دەدا بووکەڵەکان بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر دەکەوتنە سەما و جموجۆڵ.

خەڵکی گوندەکە بە گەورە و بچووکەوە، کوڕان و کچان و ژن و پیاوانی تاتاری لەو شوێنە و دەوری چۆمەڵەکە کۆ بووبوونەوە و بە زمانێکی تایبەت و سرتوخورت دەیانگوت:

– ئاهـ ڕووس، ئاهـ ئیڤان!...



عەبدول کاتژمێرە ڕووسییەکەی خۆی کە خراپ بووبوو و کاری نەدەکرد بردی بۆ لای ژیلین و بە زمانی خۆی و ئیما و ئاماژە تێیگەیاند کە کاتژمێرەکەی خراپ بووە، ژیلین گوتی:

– دابێنە بزانم، باشە چاکی دەکەمەوە.

کاتژمێرەکەی لە عەبدول وەرگرت و بە نووکی چەقۆ پشتەکەی کردەوە و دوای ئەوەی ماوەیەک پێوەی خەریک بوو پشتەکەی بەستەوە و دایەوە دەست ئەرباب و گوتی:

– سەعاتەکەت وەک هەوەڵ کەوتۆتەوە کار.

ئەرباب بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو چاکەی بکاتەوە بەپەلە هەڵاتەوە بۆ ماڵی خۆیان و کراسە کۆنێکی شڕوپەتۆری هێنا و دای بە ژیلین.

ژیلین دوای ئەوەی کراسەکەی لێوەرگرت بیری کردەوە و گوتی: «چبکەم هەر باشە، لانیکەم شەوانە کاتی خەوتن تۆزێ خۆمی پێدادەپۆشم.»

لەو ڕۆژە بەدواوە ژیلین وەک وەستا و شارەزای هەموو کارێک ناوبانگی دەرکرد و هەر لە دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە تەنانەت لە گوندەکانی دەوروبەرەوە قوفڵی کۆن و ژەنگاوی و سەعاتە شکاو و تفەنگی لەکار کەوتوو و دەمانچەی قۆڕ وچەپرەکیان بۆ دەهێنا تاکوو بۆیان چاک بکاتەوە و لەپەستا و بە لێشاو بۆیان دەهێنا. ئاخری ئاربابەکەی ئامووردەستێک و مشار و بڕغوویەکی بۆ هێنا و بەو شێوەیە کەرەسە و ئامرازی کارەکەی بۆ تەکمیل کرد.

ژیلین وەکوو وەستا و شارەزای هەموو فەن و هونەرێک ناوبانگی دەرکرد و تەنانەت کاری پزیشکی و دەواو دەرمانیش کەوتە ئەستۆی

و نەیتوانی خۆی لێببوێرێ. ڕۆژێک تاتارێک بە هەڵەداوان هات بۆلای و داوای لێکرد کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشێک لەگەڵیدا بچێ و چاوی بە نەخۆشە کەلەلاکە بکەوێ.

ئەگەرچی سەری لە کاروباری پزیشکی و دەواو دەرمان دەنەدەچوو بەڵام بە ناچاری ڕازی بوو بچێت بۆلای نەخۆشەکە و چاوی پێیکەوت. باروودۆخی تەندوروستیی نەخۆشەکەی زۆر نالەبار و مەترسیدار نەهاتە بەرچاو و خەیاڵ هەڵیگرت «وێدەچێ نەخۆشەکە وردەوردە چاک بێتەوە و هەتا چەند ڕۆژیتر عەلەمی نەمێنێ.» ئەو بۆ شوێنەونکێ هەڵات بۆ لای هەمارەکە و هێندێکی خیز و ئاوی خاوێن هێنا و لە بەرچاوی تاتارەکان خیزەکەی لە نێو ئاوەکەدا شۆردەوە و پاشان پاشماوەی ئاوەکەی دەرخوارد نەخۆشەکە دا. لەگەڵ دەرخوارددانی ئاوەکە لە بن لێوەوە ویرەویرێکی کرد و دیاربوو نێوچاوانەکەی هێناوییەتی و نەخۆشەکە دوای چەند کاتژمێر چاک بۆوە، بۆیە دوای ئەوە ژیلین لە نێو تاتارەکاندا ڕێزی چووەسەرێ و بوو بە خۆشەویستییان و تاقمێک لەوان خوویان پێگرتبوو و بەبێ ئەو هەڵیاننەدەکرد و بە تایبەت کاتێک کە کارێکیان پێیدەبوو بە ناوی «ئیڤان و ئیڤانگیان» بانگیان دەکرد. بەڵام تاقمێکی دیکەیان بە چاوی ڕق و بێزارییەوە لێیان دەڕوانی و وەک ئاژەڵێک ببینن بە لاچاوێک و بە شوەیەکی قیناوی و دڕدۆنگانە چاویان لێدەکرد و دەیانخستە ژێر چاوەدێری.

لە نێو ئەو تاتارە دژوازانەی ژیلیندا ڕیشسووریش وەبەرچاو دەکەوت و دەیاربوو زۆری ڕق لە ژیلینە و هەرکاتێک چاوی



پێیدەکەوت نێوچاوانی تێکدەنا و گنجی تێدەکەوت، بۆیە بە بێزارییەوە ڕووی لە ژیلین وەردەگێڕا و وەبەر پلاری جنێو و ناونیتکەی دەدا.

پیرەپیاوێکی ئیختیار و بەساڵاچوو لە نێو تاتارەکاندا هەبوو کە لەو گوندە دەژیا بەڵام لە پێدەشتی ئەودیوی کێوەکەوە بۆ نوێژ و تاعەت دەهات بۆ مزگەوتی گوندەکە و ژیلین بە دیتنی ئەو پیرەپیاوە ترسێکی سەیر و ڕازاوی سەرتاپای دادەگرت.

پیرەپیاو کووڕ و پشتچەماوە بوو و پەڕۆیەکی سپیی وەک مێزەر لە دەوری کڵاوەکەی پێچابوو. ڕیشێکی سپی و تۆپی هەبوو، دەتکوت پەشمەکە. بەڵام ڕوخساری سوور و پڕ لە چرچوولۆچ بوو. لووتی قەڵەنگی و قەپۆز بەرانییانەی سەرنجڕاکێش بوو و چاوە خۆڵەمێشین و زیتەکانیشی زۆر وردبین و فێڵاوی دەهاتنە بەرچاو و لەگەڵ دوو ددانی زەرد و درێژۆکە لە پووکە سوورەکەیەوە سەریان دەرهێنابوو و دەتگوت سنگن داکوتراون، شێوە و قەڵافەتێکی تایبەتییان پێدابوو. گۆچانێکی بە دەستەوە بوو کاتی ڕۆیشتن و ڕێپێوان هێزی دەدا سەری و لەنگەری خۆی پێڕادەگرت. هەموو شتێکی دەخستە ژێر چاوەدێری و یەکجار زۆر وردبین بوو، دەتگوت گورگە و لە بۆسەی مێگەلە مەڕدایە و گوێقولاغ و لەسەر هەست خۆی ئامادە کردووە بۆ هێرش. ژیلین کە چاوی بەو پیرەپیاوە دەکەوت خەم و دڕدۆنگی گیانی دادەگرت و خێرا ڕووی وەردەگێڕا. دەتگوت دوای دیتنی ئەو پیرەپیاوە ناچارە کەفارەی تاوانەکانی بدات.

ڕۆژێک ژیلین بڕیاریدا بچێت بۆ پشت کێوەکە و لە ژیان و بارودۆخی ئەو پیرەپیاوە ئاگادار بێت و بزانێ ئەو لە کوێ دەژی و حاڵ و ژیانی چۆنە. کاتێک وەڕێکەوت و بە کێوەکەدا هەڵگەڕا و گەیشتە ئەویوی شاخەکە، باخچەیەک سەرنجی ڕاکێشا کە دیوارێکی بەردینی بە دەوردا کێشرابوو، باخچەکە پڕبوو لە داری گێلاس و بلاڵووک، لەولاشییەوە ماڵۆچکەیەکی هەژارانە و سەربانێکی تەخت سەرنجی ڕاکێشا. وردە وردە کە لە شوێنەکە نزیک دەبۆوە چاوی بە پۆلێک پلوورەی مێشەنگوین کەوت کە بە قوڕ و کا ساز کرابوون و ویزە ویزی هەنگ و فڕینیان بە دەوری پلوورەکاندا دیمەنێکی سەرنجڕاکێشی ساز کردبوو. پیرەپیاو لەبەر یەکێک لە پلوورەکاندا لەسەر چۆک دانیشتبوو و دەتگوت لەبەر خۆیەوە دەبۆڵێنێ. ژیلین بڕیاریدا بە دیوارە بەردینەکەدا هەڵگەڕێ و لە شوێنێکی بەرزەوە نێو باخچەکە بخاتە ژێر چاوەدێری و شتێکی بۆ مەعلووم بێ. کە لەناکاو گویزنگی لاقی لە بەردێک درا و تەقەی لێهەستا. پیرە پیاو تەقوکوتەکەی بیست و بە دیتنی ژیلین وا ڕقی هەستا و ئاڵەتی بوو کە دەستی برد بۆ کەلەکەی و دەمانچەکەی دەرهێنا و چەند گوللەی بە ژیلینەوە نا. بەڵام ژیلین گورج و خێرا خۆی فڕێدایە پشت بەردێکی گەورە و خۆی مات کرد.

پیرەپیاو خۆی گەیاندە لای ئەربابەکەی ژیلین و دەستیکرد بە گلەیی و بناشت و سکاڵاکردن لە دەست ئەوکارەی ژیلین. ئەرباب ژیلینی بانگ کرد و بە پێکەنینەوە لێیپرسی:

– بۆچووی بۆلای ئەو پیرەپیاوە؟



– خۆ من هیچ ئازارێکم پێنەگەیاندووە و زەرەریشم لێنەداوە تەنیا دەمویست لە بارودۆخی ژیانی ئاگادار بم.

ئەرباب قسەکانی ژیلینی بە شێوەیەکی کوتوپڕ حاڵی بووبوو بۆ پیرە پیاو گێڕایەوە. بەڵام کابرا پیرە وەها تووڕە بووبوو و ڕقی هەستابوو بە شێوەیەکی تێکەڵ پێکەڵ قسەی دەکرد و دۆ و دۆشاوی تێکەڵ کردبوو و کەس نەیدەزانی دەڵێ چی و جاروبار بە قامکی ئاماژەی بە ژیلین دەکرد و دەیگوڕاند.

ژیلین لە هەموو قسەکانی پیرەپیاو نەدەگەیشت بەڵام بە شێوەی ڕاوێژ و دەمودووی پیرەپیاودا بەو ئاکامە گەیشت کە دەڵێ: ئەو بۆرە پیاوە هیچوپووچە بکووژە، دەیویست بە ئەربابی بسەلمێنێ کە ڕووسی بۆ ئەوە نابێ لە هۆبە و گوندی خۆتدا ڕایگری و واچاکە لەنێوی بەری. ئەو قسانەی کرد و بە کۆمەکۆم ڕۆیشت بەرەولای کێوەکە.

ژیلین پرسیاری لە ئەربابەکەی کرد کە ئەو پیرەپیاوە کێیە و چکارەیە؟

ئەرباب گوتی:

– ئەو پیاوێکی گەورە و بەڕێزە! ئەوە یەکەم «جیگیت[2]»ە کە ژمارێکی زۆر ڕووسی بە هۆی ئەوەوە بوونەتە قوربانی. هەروەها خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆرە. ئەو سێ ژن و هەشت کوڕی هەبوو کە هەموویان لە گوندێک دەژیان. بەڵام ڕووسەکان هێرشیان کردە سەر گوندەکە و حەوت دانە لە کوڕەکانیان کوشت و تەنیا یەکیان

٢- Gigit جوامێر و بەجەرگ

نەجاتی بوو کە خۆی بە دەستەوەدا و لەلایەن ڕووسەکانەوە بە دیل گیرا. ماوەیەک بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی پیرەپیاو خۆشی چوو بۆ نێو ڕووسەکان و خۆی بە دەستەوەدا، ماوەی سێ مانگ لەگەڵ ئەوان ژیا و دوای ئەوەی کوڕەکەی خۆی دۆزییەوە کردی بە قوربانی گوللەیەک، پاشان خۆی دەرباز کرد و هاتەوە. لەوکاتەوە ئیتر وازی لە شەڕ و کێشە هێناو بۆ بەجێهێنانی تاعەت و فەرمانی خودا ڕۆیشت بۆ مەکە و دوای ئەوەی ڕێوڕەسمی حەجی بەجێ هێنا و هاتەوە، مێزەرێکی سپیی لە سەری پێچا و ناوی حاجی بە سەریدا برا. ئەو زۆری ڕق لە ئێوەی ڕووسییە و ڕاشکاوانە داوای لە من کرد کە بتکەم بە قوربانی گوللەیەک و کۆتایی بە ژیانت بهێنم، بەڵام من قەت کاریوا ناکەم و هۆیەکەشی ئاشکرایە، چونکە من پارەم داوە بە ئەربابەکەی ئێستای تۆ، جگە لەوەش من زۆرم تۆ خۆش دەوێ و بە پیاوێکی ڕاست و باشت دەزانم. بۆیە قەت دەستم بە خوێنی تۆ سوور ناکەم و ناهێڵم قەتیش لێرە بڕۆی. دڵنیاشم کە خەیاڵی هەڵاتن و خۆدەرباز کردن لە سەرتدا نییە و قەتیش نابێ.

ئەو دوای ئەوەی ئەو قسانەی بە زمانی ڕووسی بە شێوەیەکی کوتوپڕ و بێمانا درکاند ڕوخساری خوێنی شادی و نەشەی تێگەڕابوو و پێدەکەنی، کوتی: «ئیڤان تۆ زۆر پیاوی چاکی. من عەبدولیش باشم!»



## (٤)

ژیلین بەو شێوەیە مانگێکی ڕابوارد، ئەو بە ڕۆژدا خۆی بە دروستکردنی کاردەستییەوە خەریک دەکرد و شەوانەش کە بێدەنگی باڵی بەسەر گوندەکەدا دەکێشا دەستیدەکرد بە هەڵکەندنی زەوی و دروستکردنی ڕەهۆڵێک بۆ دەربازبوون. هەڵبەت کۆڵینی زەوی بۆ ئەو کارێکی زۆر دژوار و گران بوو، ئەو دوای کونکردنی عەرزەکە گەیشتە خەندەکی دیوارەکە و بەردێکی گەورەی هاتەبەر بەڵام ئاخری ئەویشی کون کرد و توانیی ڕێگایەک بکاتەوە و دەیتوانی لەوێوە بڕواتە دەرێ و خۆی دەرباز بکات. دوای ئەوەی ڕەهۆڵەکەی ئامادە کرد بەخۆی گوت «من دەبێ نزیکترین ڕێگا بۆ هەڵاتنەکەم هەڵبژێرم و وابێ زۆر بە ئاسانی بتوانم هەڵێم، دەبێ ڕەوگەی خۆم دەستنیشان بکەم و هەموو بارێکی لەبەرچاو بگرم، چونکە دەزانم و لێم ڕوونە هیچ تاتارێک یارمەتیم نادات و ڕێنوێنیم ناکات و هیچ زانیارییەکم نادەنێ.»

ئەو ڕاست کاتێکی هەڵبژارد کە ئەربابەکەی لە ماڵێ نەبوو، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ دەستیکرد بە پیاسەکردن لە نێو گوندەکە و وایئنواند کە جگە لە ڕاوێچکەکردن هیچ نیازێکیتری نییە و وردە وردە لە گوندەکە چووە دەرێ و خۆی گەیاندە بەرقەدی کێوەکە. دەیویست خۆی بگەیەنێتە سەر ترۆپکی کێوەکە و بە جوانی ڕێگاوبانی دەوروبەر بخاتە ژێر چاوەدێری و ڕێگای دەربازبوونەکەی

هەڵبژێرێ. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئەرباب کاتی چوونەدەرێ لە گوندەکەی کورەکەی خۆی حاڵی کردبوو کە چاو لەسەر ژیلین هەڵنەگرێ، لێی خافڵ نەبێ و هەڵسووکەوت و هاتووچۆکانی بخاتە ژێر چاوەدێری. بۆیە کورە دوور و نزیک بە دوایەوە بوو و بۆیدەرکەوت کە ژیلین بەرەو دوندی کێوەکە ملی پێوەناوە، بۆیە بە هەڵاتن ڕۆیشت بە دوایدا و هەرای لێکرد:

– مەڕۆ، ئەوە بۆکوێ دەچی؟ باوکم ڕایسپاردووم چاوم بەسەرتەوە بێت. ڕانەوەستی هەر ئێستا بانگ لە خەڵکی نێودێ دەکەم!

ژیلین دەستیکرد بە قسەکردن لەگەڵیدا و دەیویست خاترجەمی بکات کە ڕاناکا، گوتی:

– خەمت نەبێ زۆر دوور ناکەومەوە. تەنیا حەز دەکەم بچمە سەر ئەو کێوە، چونکە لە گیایەکی دەرمانی دەگەڕێم و دەمهەوێ بیدۆزمەوە و بۆ نەخۆشیی خەڵکی گوندەکە زۆر بەکەڵکە. ئەگەر بڕوام پێناکەی دەتوانی خۆشت لەگەڵم بێی، خۆ بەو قوفڵ و زنجیرانەی لاقم و دەستمەوە ناتوانم هەڵێم و لەوەش گرینگتر سبەینێ تیروکەوانێکی چاک بۆ تۆ دروست دەکەم. هەرچۆنێک بوو کورەی ڕازی کرد و پێکەوە بە کێوەکەدا وەسەر کەوتن. ژیلین کە لە لووتکەی کێوەکە نزیک بوونەوە بۆی دەرکەوت کە زۆریش ڕێگایەکی سەخت و دژوار نییە. بەڵام ئەو زنجیر و قوفڵانەی لاقی نەیدەهێشت بە باشی هەنگاو بنێ و ڕۆیشتنەکەی دژوار کردبوو. ئەو بە تەواوی توانا و وزەی خۆیەوە وورەی وەبەر خۆینا و هەورازەکەی بڕی و خۆی گەیاندە ترۆپکی کێوەکە.



کە گەیشتە سەر دوندی کێوەکە ژیلین دانیشت و دەستیکرد بە چاوگێران و ڕوانین، لەوێوە هەمارەکە کەوتە بەرچاوی و لەولاتریشەوە گۆڕەپانێکی بەرین دەشتێکی سەوز و پڕگیا کە مێگەلە مەڕ لەوێدا پەلیان هەڵخستبوو و دەلەوەڕان. لەوبەری کێوەکەوە و لە پێدەشتەکەیدا گوندێکی چکۆلەیتر دیاربوو، لەولای گوندەکەشەوە کێوێکیتر هەڵکەوتبوو. کە چۆمێک بەلاپاڵەکەیدا دەهاتە خوارێ و دیاربوو لە بەفراوی کوێستانە بەرزەکانەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە دوورەوە وەک کەللە قەند سپی دەچوونەوە و بەفر داپۆشیبوون. یەکێک لەو کێوانە کە لە کێوەکانیتر بەرزتر بوو شێوەی زۆر لە کڵاو دەچوو.

ژیلین دوای ئەوەی بە وردی چاوی لەو دوور دوورانە بڕی لەلای ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کێوەکانەوە چەند گوندی چکۆلەی دی کە دووکەڵێکی مەیلەوسپی لە سەربانەکانیان دەهاتە دەرێ و بەرەو ئاسمان هەڵدەچوو و لەگەڵ شینایی ئاسمان تێکەڵ دەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڵێ ئەو کێوە دوورەدەستانە وڵاتەکەی خۆمانە.»

زۆر بە قووڵی چاوی لە مەڵبەندە ڕووسنشینەکەی خۆیان بڕی. چاوی لە هەرلایەک دەکرد شاخ و کێو بوو و لە خواریشەوە چۆم و گوندی ئەربابەکەی کە لەوێ دیل و دەستبەسەر بوو و باخەکانی دەوروبەریش هەموو بە جوانی دیاربوون. چۆمێکی دی کە بە بەینی دارەکاندا تێدەپەڕی و لە خوار گوندەکەوە ژنان لە بەستێنی خوڕێنکەکەی خەریکی شیوو کوڵ بوون. لە دوورەوە هەموو لە بووکە باخەی زەرد و سوور دەچوون. هێندێک لەولاترەوە چاوی بە

کێوێک کەوت کە دوو زنجیرەکێوی‌تر پێوە لکابوون و لەوپەڕی دوو کێوەکەوە لێڕەوارێکی سەوز و چپڕ دیاربوو. کە ڕێگایەکی باریک و خواروخێچ لەوێ جیا دەبۆوە و زۆر لە دوورتریشەوە توولە ڕێیەکی‌تر وەک مارێکی بۆر و ڕاست سەرنجی ڕاکێشا.

ژیلین بە خەم و دڵگرانییەکی زۆرەوە ئەم خەیاڵانە بە مێشکیدا هاتن: «کاتێک لە قەڵاکەی خۆمان بووم لە شوێنێک کە بەیانی کاتێک خۆر پرشنگی زێڕینی بەسەر دەشت و قەڵاکەدا دەباراند و لای ئێوارەش لەگەڵ زەردەپەڕ ماڵئاواییی لە دەشت و باخان دەکرد، بەڵێ لەوێ چ ژیانێکی خۆش و شاد و بێ‌خەممان ڕادەبوارد، ئەرێ ئەوێ، ئەو دوور دوورانە قەڵاکەی ئێمەیە... بەڵێ لەوێوە دەبێ لە نێوان ئەو دوو کێوەوە دەربازبم و بچم بەودیودا و خۆم لە چنگ ئەو بارودۆخە تاڵ و پڕئازارە نەجات بدەم.»

خۆر بەرەو ئاسۆی ڕۆژاوا خۆی دەکوتا و لووتکەی بەفرینی کێوەکان وردە وردە ڕەنگە سپییەکەیان خەریک‌بوو زەرد هەڵدەگەڕا. دوای چەند ساتێک لووتکەی کێوەکان لێڵ و تاریک داگەڕان و لەو دوورەوە دەتگوت شتێکی وەک تەمومژ بەرز دەبێتەوە. تاسەبارانە دیسان مەلی چاوی هەڵفڕاند و خەیاڵی پێوە گرێدا. «بەڵێ، لەوێ لە قەڵاکەی خۆماندا ئێستا هاوقەتارەکانم لە شوێنی خۆیان جێگیر بوون و هەرکام لە بیری کاروباری خۆیاندان.» ئیتر خۆر بە سوورهەڵگەڕاوی سەری نایە نێو کۆشی چیا و هەموو وڵات زەرد هەڵگەڕا و پەڵەهەوری دەم ئاسۆی ڕۆژئاوا دەتگوت پۆلووی گەشاوەن و وڵات لەبەرچاوی سوور هەڵگەڕابوو.



ژیلین بەو ئاکامە گەیشت کە لەو دوور دوورانە کە دووکەڵ وەک کۆڵەکە وەبەر ئاسمان دراوە قەڵای ڕووسەکان یانی شوێنی سەرەکیی خۆیانە، دەی وادیارە ڕۆژ درەنگانە دەبێ بڕۆینەوە بۆ ماڵێ. دەنگی مەلای گوندەکە هاتە گوێی کە بانگی شێوانی‌دا و مێگەلەکەش بەرەو ئاوایی خێزەرەیان بەست و گاڕانیش بە بۆڕە بۆڕ خۆیان کرد بە نێو گوندەکەدا و کوڕەش لە پەستا دەیگوت: «با بڕۆین». بەڵام ژیلین حەزی نەدەکرد و ڕێی دانەدەگرت.

ئاخری ژیلین و کوڕی ئەرباب لە کێوەکە داگەڕان و گەیشتنەوە ماڵێ. ژیلین بە دەم ڕێوە بیری دەکردەوە «ئیتر هەموو شتێکم بۆ ڕوون بۆتەوە و حەتمەن ڕادەکەم و خۆم نەجات دەدەم حەتمەن.» ئەو بڕیاری دابوو هەر ئەوشەوە هەڵێ.

شەوێکی زۆر تاریک و ئەنگوستەچاو بوو، مانگ هەڵنەهاتبوو. بەداخەوە هەر ئەوشەوە ئەربابەکەی و تاقمێک تاتار گەڕانەوە بۆ گوندەکە و بەپێی دابو خدەی خۆیان کە دەستیان دەکرد بە بەزم و گەڕەلاوێژە و ڕەوەکانیان بەرەو ئاوایی ڕادەدا، بەڵام مەعلووم نەبوو بۆچی ئەمجارەیان دەنگی گۆرانی و ویرەویران نەدەهاتە گوێ و مێگەل و ڕەوەیان پێ‌نەبوو، بەجێی مێگەل تەرمێکیان پێبوو کە لەسەر زینی ئەسپێک بە مەفرەشبار دەیانهێنا و هەموو مات و خەمبار تەرمەکەیان بۆ کفن و دفن هێنابوو و تەرمەکەش دیاربوو برای ڕیش‌سوورە. ئاپۆرەی خەڵک بە شێوەیەکی ماتەمبار و خەمناک و تووڕە لە دەوری تەرمەکە کۆزیلکەیان بەست، ژیلین لە هەمارەکە هاتە دەرێ و بۆ دیتنی ئەو دیمەنە خۆی گەیاندە لای خەڵکەکە و بۆی

دەرکەوت کە تەرمێک ڕاکێشراوە، کفنی سپییان تێ‌پێچاوە و لەسەر چیمەنی ژێر دار چنارێک دایاننابوو و مەلای گوند و هەموو ڕیش‌سپییەکانی خێڵەکە پەڕۆی سپییان لە سەریان هاڵاندبوو، کۆ بووبوونەوە و پێنج هەنگاو دوور لە مردووەکە لەسەر چۆک دانیشتبوون.

لە پێش هەموویانەوە مەلای گوندەکە و لە پشت سەریەوە سێ کەس لە ڕیش‌سپییەکانی ئاوایی و ڕیزی سێهەمیش تاقمێک لە تاتارەکان ئارام و بێدەنگ دانیشتبوون. دوای ئەوەی بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەر ئەو شوێنەدا کێشا، مەلا سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و هاواری کرد:

– ئەڵڵا! دوای دەربڕینی ئەو وشەیە بێدەنگی وڵاتی داگرت و هەموو بێدەنگ بوون و جووڵە و مەتەقیان لە خۆیان بڕی. لەگەڵ ئەوەی بە کڕوکپی دانیشتبوون، ئەویش زۆر خەمبار و دڵتەنگ، کە مەلا دیسان سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و دەنگی هەڵێنا:

–ئەڵڵا! هەموو حازریان پێکەوە دووپاتیان کردەوە «ئەڵڵا» دیسان بێدەنگی باڵی بەسەر ئاپۆرەی خەڵکەکەدا کێشایەوە. پاشان بەرەوڕووی تەرمەکە لەسەر چۆک دانیشتن و وەک مردوو جووڵەیان لە خۆیان بڕی و هیچ کەس نە ورتەی لێوەدەهات و نە جووڵەی دەکرد. تەنیا خشەخشی گەڵای پەنجەیی دارچنارەکە نەبێ کە بە دەم بای دەمەوئێوارەوە دەشنییەوە، تۆزێ بێدەنگییەکەی دەشکاند. دوای ماوەیەک مەتەق و جووڵە لەخۆبڕین مەلا دەستی‌کرد بە نوێژکردن و دوای تەواو بوونی نوێژەکەی هەموو هەستانە سەرپێ و



مردووەکەیان لەسەر دەستان بەرز کردەوە و بەرەو قووڵکەکەیان برد و لە نزیک لێواری قووڵکەکە دایاننا. هەڵبەت قووڵکەکە ئاسایی نەبوو لە سەرەوە گەورەتر و لە ناوەوە بە ئەندازەی تەرمەکە قووڵ و باریک هەڵیانکەندبوو. دوای چەند خولەک بە ڕێزەوە تەرمەکەیان هەڵگرت و لەسەر لاتەنیشت لە نێو قووڵکەکەدا ڕایانکێشا و سەری کفنەکەیان کردەوە و بەر لەوەی بەردی ئەلحەد لەسەر گۆڕیچەکە دانێن و دایپۆشن هێندێکیان قامیشی سەوز هێنا و مردووەکەیان پێ‌داپۆشی و پاشان بەردی پانیان لەسەر گۆڕیچەکە دانا و گڵیان کرد بە سەریدا و قووڵکەکەیان پڕ کردەوە. دوای ئەوەی هەموو گڵە هەڵکەندراوەکەیان لەسەر گۆڕەکە هەڵدایەوە، بەردێکی درێژۆکەیان هێنا و لە ژوورسەری مردووەکە وەک کۆڵەکە چەقاندیان. پاشان بە پشتە پێمەڕە جوان گڵەکەیان کوتایەوە و ڕێکوپێکییان کرد و بە ڕیز بەرەوڕووی مەلا و گۆڕەکە دانیشتن. ماوەیەکی زۆر هەروا کوندەکی هەڵترووشکان و مەتەقیان نەکرد.

دوای چەند خولەک بێدەنگی هەموو پێکەوە دەستیان کرد بە ئەڵڵا! ئەڵڵا! و بە دڵێکی خەمین و پڕ لە داخ و کەسەرەوە هەستانە سەرپێ.

تاتارێکی قژخورمایی بڕێکی پارە لە نێوان پیرەپیاوەکاندا دابەش کرد و پاشان قامچییەکی بە دەستەوە گرت و دوای ئەوەی سێ‌جار لە نێوچاوانی خۆی ڕاکێشا بەرەو ماڵەکەی خۆی وەڕێ کەوت.

بۆ بەیانی ژیلین بۆی‌دەرکەوت سوارکارێک کە سواری ئەسپێکی شێ بووبوو لەگەڵ سێ کەسی دیکە کە ئەوانیش ئەسپ‌سوار بوون و بە دوایدا دەهاتن، دوای هێندێ قسەو باس و ڕاوێژ دیتی کابرای

مووخورمایی قۆڵی هەڵماڵیوە و خەنجەرێکی گەورەی لە کالانی نێوقەدی دەرکێشاوە و بۆ تیژکردنی خەنجێرەکە خەریکە لە بەردێکی دەخشێنێ. دواتر سێ تاتاری دیکە سەری ئەسپەکەیان بەرز کردەوە و هەر ئەو کابرا مووخورماییە خەنجەرە تیژەکەی بە ملی ئەسپەکەدا هێنا و زۆر بە گورجی و لێزانییەوە ئەسپە بەستەزمانەکەی گۆشاوگۆش سەربڕی و کەللەسەرەکەی فڕێدا لایەک و پاشان دەستیکرد بە کەوڵکردنی. دوای ئەوەی کاری کەوڵکردن و لەتوکوتکردنی گۆشت و ئێسکی ئەسپەکە تەواو بوو ژنان هاتن دەستیانکرد بە شۆردنەوەی ڕیخ و خوێن و خوڕەکەی. پاشان هەموویان دابەش کرد و هەرکەسەی بەشی خۆی بردەوە بۆ ماڵێ. هەموو خەڵکی گوندەکە لە دەوری کابرای مووخوورمایی کۆ بوونەوە و بۆ ڕۆحی مردووەکە پاڕانەوە و دۆعای بەخێریان بۆ کرد.

سێ ڕۆژی تەواو بە گۆشتی ئەسپەکە چێشت و خواردنیان سازکرد و بووسا[3]یان خواردەوە و دۆعایان بۆ ڕۆحی ئەو کۆچکردووە کرد و هەموویان ئەو سێ ڕۆژە بۆ پرسە و سەرەخۆشی لە ماڵی ئەوان مانەوە. ژیلین بۆ چوارەمین ڕۆژ تێگەیشت کە نزیکەی دە کەس لە تاتارەکان ئەسپەکانیان ئامادە کردووە و بەرەو شوێنێک وەڕێ کەوتن. کابرای مووخوورماییش لەگەڵ ئەوان بوو، تەنیا عەبدول لە ماڵێ مابۆوە. تریفەی مانگ لە ژێر گەواڵە هەوردا قەتیس مابوو و شەوێکی زۆر تاریک و نووتەک بوو.

٣- خواردنەوەیەکە وەک کواس و کۆمیس بەڵام ئەمە بە برینج دروست دەکرێ و تایبەتی قەزاخەکانە.



ژیلین دوای بیرکردنەوە بەو ئاکامە گەیشت کە دەبێ ئەمشەو خۆی لە چنگ ئەو ئازار و دەستبەسەرییە ڕزگار بکات. فیکر و پیلانەکەی خۆی لەگەڵ کاستیلین هێنایە گۆڕێ بەڵام کاستیلین تووشی ترس و دوودڵی بووبوو.

دوای تۆزێ بیر کردنەوە گوتی:

- ئاخر ئێمە خۆ شارەزای ڕێگا نین، ئیتر چۆن ڕاکەین؟

- من ڕێگا دەزانم.

- ئەگەر سەرەتای شەو وەڕێ بکەوین هێشتا بۆ بەیانی ناگەینەوە.

- خەمی ئەوەت نەبێ. دەبێ بڕیار بدەین و سوور بین لەسەر خۆدەرباز کردن. دەتوانین لە لێرەوارەکە خۆمان مات بدەین و هەتا شەوی داهاتوو بمێنینەوە. بۆ ئەو کارەش من هێندێکم نانەڕەق کۆ کردۆتەوە و سەری خۆمانی پێڕادەگرین. ئەگەر پێتوایە مانەوەت لێرە باشترە و بە هیوای پارەت بۆ بنێرن زۆر چاکە بمێنەوە، بەڵام ئەوەش دووبەختەکییە ڕەنگە ئەوان لە توانایاندا نەبێ ئەو بڕە پارەیەت بۆ بنێرن. ئەوەشت لە بیر نەچێ چەند ڕۆژ لەمەمەوبەر یەکێک لەو تاتارانە بە دەستی ڕووسەکان کوژراوە. ئەوان زۆر تووڕە و داخ لەدڵن و لەوانەیە بۆ تۆڵەکردنەوە ئێمە بکوژن.

کاستیلین تۆزێ بیری کردەوە و گوتی:

- باشە با هەڵێین.

**(٥)**

ژیلین بۆ ئەوەی کاستیلینیش لە کونەکەوە بچێ تۆزێ گەورەی کردەوە و هەردووکیان دانیشتن و چاوەڕوان مان هەتا بێدەنگی وڵات داگرێ و خەڵکی گوندەکە بخەون.

کاتێک بێدەنگی بە تەواوی باڵی بەسەر گوندەکەدا کێشا ژیلین لە کونەکەوە چووە دەرێ و بە کاستیلینیشی گوت بە دوایدا بێتە دەرێ.

- زووکە وەرە دەرێ.

کاستیلین بەو قوفڵ و زنجیر و ئاسنەوالانەوە کە لە لاقی کرابوو کاتێ خۆی کرد بە کونەکەدا زرە و خرەخرێکی قورسی وەرێخست.

ئەرباب سەگێکی زیت و وریا و دڕی هەبوو کە ناوی ئۆلیاشین بوو. هەڵبەت ژیلین پێشتر چونکە نان و خواردنی پێدابوو، سەگەکە هەرکە دەیدی دەستیدەکرد بە نووزەنووز و کلکەسووتێ و خۆی لە قولوقاچی هەڵدەساوی. ئۆلیاشین هەرکە دەستیکرد بە وەڕین و هێرشی بۆ بردن و سەگەکانیتر بە دوایدا بە وەڕین و هاسکەهاسک هاتن، ژیلین خێرا فیتوویەکی لێدا و پەنچکێ نانی بۆ فڕێدا. ئۆلیاشین لەڕێوە ژیلینی ناسییەوە و دەستیکرد بە کلکەسووتێ و هێور بۆوە و لە پێش سەگەکانی دیکەوە ڕاوەستا.

خاوەنی سەگەکە لە نێو ماڵەکەیەوە دەنگی هەڵبڕی:

ئۆلیاشین ئۆقرە بگرە، ئارامبەو بگەڕێوە.



بەڵام ژیلین گوێچکەی پانی سەگەکەی گرت و دەستی بە نەرمی پێدا هێنا و ئارامی کردەوە. سەگەکە هێور بۆوە و دەستیکرد بە کلکەسووتێ و نووزە نووز و خۆی لە داوودەلینگی ژیلین هەڵساوی.

ژیلین و کاستیلین ماوەیەک پێکەوە لە گۆشەیەک دانیشتن هەتا بە تەواوی بێدەنگی وڵاتی داگرت، هەتا وایلێهات جگە لە بارەباری مێگەلێک و هاژەو خوڕەی چۆم و تاڤگە هیچ دەنگێکیتر نەدەبیسرا.

هەوا بە تەواوی تاریک داگەڕابوو. ئەستێرە وەکوو وردە ئەڵماس بەسەر سینگی ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە. مانگ لە ئاسۆوە هەڵاتبوو، تریفەزێونەکەی لە ڕووی زەوی دەپرژاند و گەواڵە هەورەکان وەک هورەی لۆکە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە.

ژیلین هەستا سەرپێ و بە هاوڕێکەی گوت:

- زۆرچاکە هاوڕێ با ئەمجار وەڕێ بکەوین.

هێشتا زۆر نەڕۆیشتبوون کە دەنگی مەلای گوندەکە لە سەربانی مزگەوتەوە بەرز بۆوە.

- «ئەڵڵاهوئەکبەر، ئەڵڵاهوئەکبەر!» بەو بانگە خەڵکی بۆ مزگەوت و نوێژ و تاعەت هان دەدا. ئەوان ناچار بوون ماوەیەک ڕاوەستن و خۆیاندا پەنا دیوارێک بۆ ئەوەی خۆیان لە چاوی خەڵک بپارێزن.

ماوەیەک دانیشتن و چاوەڕوان مانەوە تا خەڵک یەکیەک و دوو دوو لەوێوە تێپەڕین و دوور کەوتنەوە و بێدەنگی دیسان وڵاتی داگرتەوە.

پاشان لە قوژبنی دیوارەکە هاتنە دەرێ، خاچی خۆیان کێشا و بە هیوا و پشتیوانیی خودا وەڕێکەوتن. دوای ئەوەی لە ماڵەکان دوور

کەوتنەوە گەیشتنە چۆمێک و دوای ئەویش دەشتانییەکی پان و بەرین کە تەمومژێکی چڕ دایگرتبوو، بەڵام ئەستێرەکان بە جوانی لە ژوور سەریان سریوەیان دەهات و چاوەبڕکێنەیان لەگەڵ زەوی دەکرد، تریفەی مانگ وڵاتی ڕووناک کردبۆوە و ژیلین و کاستیلین دەیانتوانی باشتر سەرەندەر بکەن و درێژە بە ڕێگاکەیان بدەن. بەڵام ئەو چەکمانەی لە پێیاندا بوو زۆری ئازار دەدان. ژیلین ناچار بوو دایانبکەنێ و فڕێیدانە قووڵکەیەکەوە و بە پێخواسی وەڕێکەوت، بەڵام کاتی هەنگاونان بەسەر چقڵ و بەرد و چەودا زۆری ئازار پێدەگەیشت، بە ڕوانین لە ئەستێرەکان درێژەیان بە ڕێگاکەیان دەدا. کاستیلین وردەوردە خەریکبوو وەدوا دەکەوت و بە ژیلین نەدەگەیشتەوە.

کاستیلین بە هێواشی گوتی ئەو چەکمانە بەجارێ لاقوقولیان بریندار کردووم و ناتوانم بەڕێدا بڕۆم.

ژیلین گوتی: تۆش وەکوو من واز لە چەکمەکانت بێنە و فڕێیان بدە، بە پێخواسی باشتر دەتوانی بە ڕێدا بڕۆی.

کاستیلین چەکمەکانی لە پێی داکەند، توورِی هەڵدان و بە پێخواسی کەوتە ڕێ. بەڵام لاقوقولی بەجارێ شەرزە و بریندار بووبوون و هێندەی لە بەرد و خیز و چەوی دۆڵ و کەندولەندان دابوون و کولابوونەوە لەبەر ژان و ئازاری لاقی نەیدەتوانی شان بەشانی ژیلین بڕوات سات لەدوای سات وەدوا دەکەوت. ژیلین پێی‌گوت:

– ئەگەر لاقوقولت هەمووشی تواتوا بێ، دوای دەربازبوونمان چاک دەبێتەوە، بەڵام بێتوو شوێنمان هەڵگرن و بمانگرنەوە حەتمەن



هەردووکمان دەکووژن و نەجاتبوونمان مەحاڵە. کەوایە دەبێ ژانی برینداربوونی لاقوقولمان تامڵ بکەین و هەر ئەمەمان باشترە.

کاستیلین بێ‌ئەوەی زمانی بگەڕێ دانی بە جەرگی خۆیدا گرت و بە دوای ژیلیندا ملی ڕێی گرت. ماوەیەک درێژەیان بە ڕێگای خۆیان و بڕینی خیزەڵان و ڕژد و هەڵەتاندا، بەڵام لەپڕ لەلای ڕاستەوە لە ناکاو چەقولووری سەگ پەیدا بوو.

ژیلین ڕاوەستا و چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا و زۆر بە پارێزەوە بەرەو تیرەشانی کێوەکە خوشی، دەستی‌نایە سەر دەستی و بە خەم و دڵگرانییەوە گوتی:

– ئاخ، من تووشی هەڵە بووم، ئێمە دەبوو بەلای دەستە چەپدا بڕۆیشتبایەین. لەولایەوە گوندێکی‌تر هەڵکەوتووە و من لەسەر کێوەکەوە ئەو ڕۆژە چاوم بەم گوندە کەوت. ئێستا دەبێ بگەڕێینەوە و بەلای دەستە چەپدا درێژە بە ڕێگاکەمان بدەین. ئەم لایە هیچ دارو لێڕەوارێکی لێ‌نییە، خۆمانی تێدا حەشار بدەین.

کاستیلین گوتی:

– تۆزێ ڕاوەستە با وچانێک بدەین، من لاقوقولم تەواوی کۆڵەوار بووە و خوێنی لێ‌دەچۆڕێ.

– نا براکەم گوێی مەدەیە، ئەوانە سارێژ دەبن و لە بیرت دەچێتەوە، بە دوای مندا وەرە و وەک من بەسەر بەردەکاندا باز بدە، ئاوا، وەک من بە قەڵمباز بڕۆ.

ژیلین بەرەو دواوە پێی پێوەنا و بەلای دەستە چەپەدا بای‌دایەوە و ڕووی کردە کێو و لێڕەوارەکە.

کاستیلین لە تاوی لاقی دەینالآند و لەپەستا پرتەوبۆڵەی دەهات و وەدوا دەکەوت. ژیلینیش بەردەوام ورەی وەبەر دەنا و دڵخۆشیی دەدایەوە و بە گوڕ و تینەوە لە پێشییەوە دەڕۆیشت.

هەردووکیان گەیشتنە سەر تیرەگەکە. ژیلین گوتی: ئەوەتا لێڕەوارەکە، خۆیەتی ئیتر نەجاتمان بوو. هەردووکیان خۆیان کرد بە نێو لێڕەوارەکەدا. بەڵام دڕوداڵ و چاڵووک هەموو جلو بەرگەکەیانی دڕاندبوو و دوای بڕینی چاڵوچۆڵ و خیزەڵان و دڕکەکان گەیشتنە سەر توولەڕێی نێو دارستانەکە و ملی ڕێیان گرت.

ژیلین لە ناکاو گوتی: ڕاوەستە! وادیارە خرمەی سمی ئەسپ لەولای توولە ڕێکەوە دێ.

هەردووکیان ڕاوەستان، دوای ئەوەی خرمە خرمەکە تەواو بوو وەڕێ کەوتنەوە، بەڵام دیسان خرمەی سمی ئەسپەکە لە جێی خۆیان مێخکوتی کردن. دوای ئەوەی تۆزێ ڕاوەستان و گوێیان هەڵخست دیسان خرمەخرمەکە ئاسەواری نەما. ژیلین بەرەو پێشەوە خوشی و لەسەر سپیاییی ڕێگەکە شتێکی دیی ڕاوەستابوو. نە ئەسپ بوو نە شتێک لە شێوەی مرۆڤ، دوای چەند چرکەیەک ئەو شتە نامۆیە پرمەیەکی لێوەهات کە ژیلین دوای بیستنی پرمەکەی گوتی: «شتێکی سەیرە» زۆر بە هێواشی فیتوویەکی لێدا و گیاندارەکە بە بیستنی فیتووەکەی وەک تیسکەی تفەنگ بۆی دەرچوو و خۆی کرد بە نێو دارو دەوەنی لێڕەوارەکەدا خشوهۆڕی سازکرد و لکوپەلی دەوەنەکانی دەشکاندەوە و تۆقیوانە غاری دەدا.



کاستیلین لە ترسانا بەجارێ زەندەقی چووبوو، ئەژنۆی لەرزی و دڵی بووراوە و بە بێهۆشی لەسەر چەقی ڕێگاکە کەوت بە زەویدا. ژیلین بە پێکەنینێکی گاڵتەئامێزانەوە گوتی:

– بۆ ئاوا دڵت لەخۆت بۆوە، مەگین نەتبیست چۆن بە شاخی لکوپەلی دارەکانی دەشکاندەوە؟ ئەو گیاندارە بزنەکێوی بوو. مەگین ئەو پەندەت نەبیستووە دەڵێ: هەردوولا لە تفەنگی خاڵی دەترسن. ئێمە لە ئەو ترساین و ئەویش لە ئێمە.

دیسان ملی ڕێیان گرتەوە. خەریکبوو تاریکو ڕوونی بەیانی بەسەردا بێت و کازێوەی بەیان بەرەوپیریان دەهات. ژیلین لە دڵی خۆیدا دەیگوت «نازانم ئەم ڕێگایە ڕێگای سەرەکییە یان بە هەڵە گرتوومانەتەبەر. بڵێی ئەمە هەر ئەو ڕێگایە بێ کە منیان پێیدا هێنا بۆ گوندەکە؟ ئەگەر ئەو ڕێگایە بێت نزیکەی دە وێرستمان ماوە.» چونکە ڕێگاکە زۆر بەلایەوە نامۆ بوو و هیچ نیشانە و ڕێنوێنێکی نەبوو تاریکیی شەویش دەستی دابووە دەستی ناشارەزاییەکەی و بە هیچجۆرێک بۆی نەدەچووەوە سەریەک. لە لێڕەوارەکە تێپەڕین و دەشتێکی پان و بەرینیشیان بڕی. کاستیلین دانیشت و گوتی:

– هەرچی دەبێ با ببێ، من ئیتر ناتوانم، هەنگاوێکیتر هەڵێنمەوە، ئیتر هێزم نەماوە و لاقم لەکار کەوتوون و عەرز ناگرن.

ژیلین دیسان دەستیکرد بە ورەوە وەبەرنان و دڵخۆشیدانەوەی.

کاستیلین گوتی: نا ئیتر ناتوانم، هەنگاو هەڵێنمەوە، ئیتر ناتوانم نا.

ژیلین بە تووڕەیی و ڕقهەستاوانە تفێکی لە زەوی کرد و دەستیکرد بە جنێودان و قسەی سووک بە کاستیلین.

– کەوایە خۆم بە تەنیا دەڕۆم، خوداحافیز.

کاستیلین هەستا و بە ناچاری کەوتە دوای. ئەوان نزیکەی چوار کاتژمێر بەڕێدا ڕۆیشتن. تەمومژێکی چڕ دەشت و لێڕەوارەکەی تەنی و بە حاڵەحاڵ پێش خۆیان دەدی. تەنیا سۆڵە سۆڵی کزی چەند ئەستێرەیان دەدی بە ئاسمانەوە بریقەیان دەهات.

لە ناکاو خرمەی سمی ئەسپێکیان بیست بەرەو ڕوویان دەهات و تەقوکوتی ناڵەکانی دەهات کە بەسەر ڕێگا ڕەقەن و بەردەڵانەکەدا دەڕۆیشت. ژیلین لەسەر زگ ڕاکشا و گوێی بە عەرزەکەوە نا.

– ئەها، وادیارە ئەسپێک بەرەو لای ئێمەی دێ!

هەردووکیان بە هەڵەداوان لە ڕێگاکە دوور کەوتنەوە و لە نێو دەوەن و گیاو گژی دارستانەکەدا خۆیان حەشاردا و چاوەڕوان دانیشتن. ژیلین هێور هێور بۆلای ڕێگاکەوە خوشی و ڕوانیی، دیتی تاتارێک بە سواری ئەسپ گایەکی وەپێش خۆی داوە و لێیدەخوڕێ، لەبەر خۆیەوە پرتەو بۆڵەی دێ و شتێک دەڵێ. کابرای تاتار بەبەر دەمیاندا هات و تێپەڕی، ژیلین بۆلای کاستیلین ئاوڕی دایەوە و گوتی:

– دەبێ شوکری خودا بکەین نەجاتمان بوو، خەتەر بە بناگوێماندا تێپەڕی، هەستە با بڕۆین. کاستیلین بە بێوازی هەستا، بەڵام هێزی ئەژنۆی نەبوو هەنگاو هەڵێنێتەوە و کەوت بە عەرزیدا.

– بەخودا ناتوانم بە ڕێدا بڕۆم، ئیتر بڕستم لێبڕاوە و تاقەت و توانام نەماوە.

کاستیلین چونکە پیاوێکی قەڵەو و گۆشتن بوو لەبەر شەکەتی هێندەی ئارەقە کردبوو ئازای ئەندامی خووسابوو. ئەو تەمومژە چڕەی



لێڕەوارەکەی تەنیبوو ئەوەندەی‌تر لەشی سست کردبوو و تەزاندبووی. ژان و ئازاری لاقە بریندارەکەشی سەرباری دەردان بوو. ژیلین بە هەموو هێز و قەوەتی خۆی باوەشی پێدا کرد و ویستی یارمەتیی بدات و هەڵیبستێنێتە سەرپێ، بەڵام کاستیلین هاواری لێهەستا:

– کوڕە مردم، ئەو ژانە کوشتمی!

ترس سەرتاپای ژیلینی داگرت و گوتی:

– ئەو هاوار و هەڵڵایەت لەچییە؟ مەگین نازانی ئەو تاتارە هێشتا لێمان دوور نەکەوتۆتەوە و لەوانەیە گوێی لە دەنگمان بێت؟ ژیلین هێندێکی بیر کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی:

«ئەو بەڕاستی وزە و توانای خۆی لە دەست داوە و بەجارێ هێزی لێبڕاوە. ناهەقی نییە. نازانم چیی لێبکەم؟ خۆ واز لێهێنان و بەجێهێشتنی ناکرێ و کارێکی نامرۆڤانە و بێویژدانانەیە.»

ژیلین گوتی: هەستە، باشە هەستە لە کۆڵت دەکەم، وادیارە هێز و بڕستت لێبڕاوە و ناتوانی بە ڕێدا بڕۆی.

کاستیلینی لە کۆڵ کرد و بە هەردوو دەستی لەنگەری گرت و بەرەو لای ڕێگاکە وەڕێ کەوت.

کاستیلین وەک دۆڵپا چنگی لە شان و ملی ژیلین توند کردبوو و خەریکبوو بیخنکێنێ. ژیلین گوتی: تۆ حەزرەتی مەسیح ئەوەندە گوشار بۆ ملم مەهێنە، خەریکە بمخنکێنی، دەست بە شانمەوە بگرە.

کاستیلین زۆر قورس بوو و ژیلین لەوانەبوو پشت و چۆکی بشکێ، لاقوقولە پەتییەکەشی هەمووی بریندار بووبوو و خوێنی لێدەچۆڕا و لە ژێر ئەو بارە قورسەشدا هێندەی‌تر گوشار بۆ لاقی دەهات و درک

و بەردیان تێهەڵدەچەقی. جارجار کاستیلینی لەسەر پشتی هەڵدەتەکاند بۆ ئەوەی کێش و قورساییەکەی کەم بکاتەوە. هەڵگرتنی ئەو جەندەکە قورس و نالەبارە بەڕاستی بۆ ژیلین دژوار بوو و لاقوقولە زامارەکەشی ئەوە سەرباری دەردان بوو. چەند هەنگاو دەڕۆیشت و خۆی کۆم دەکردەوە و کاستیلینی هەڵدەتەکاند تاکوو باشتر قەوەی پێی بشکێ. هەرچۆنێک بوو کاستیلینی گەیاندە سەر ڕێگاکە.

ژیلین لە دڵی خۆیدا گوتی: «لەوانەیە ئەو تاتارە هاوارەکەی کاستیلینی بیستبێت و بگەڕێتەوە بۆ گیانمان.»

لەناکاو ژیلین خرمەی سمی ئەسپێکی بیست بە دوایاندا دەهات، ئاوڕی دایەوە تاتارێکی ئەسپسوار و تفەنگ بەدەست لەولاوە دەهات. تاتار ویستی تەقەیان لێبکات بەڵام تفەنگەکەی چرتەی پەلەپیتکەی هات و گوللەکەی دەرنەچوو. ژیلین خۆی خستە نێو دەوەن و گیا و گژەکانەوە و کابرای تاتار هێندێ پرتەوبۆڵەی لێوەهات کە ژیلین تێنەگەیشت دەلێچی، پاشان مامزەیەکی لە ئەسپەکەیدا و پاشاوپاش کشاوە سەرڕێگاکە و دوور کەوتەوە.

ژیلین گوتی: دەی براکەم وادیارە نێوچاوانەکەمان نەیهێناوە، ئێستا ئەو نەگبەتە تاتارەکانیتر لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە و هەموویان دەکەونە شوێنمان، بێتوو دوور نەکەوینەوە و خۆمان دەرباز نەکەین، خاترجەمبە دەکووژرێین و خاشەمان دەچنن.

ئەوان نزیکەی سێ وێرستی دیکەیان ڕێگا بڕی. ژیلین لەگەڵ ئەوەی بیری لە کاستیلین دەکردەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «نازانم چ شەیتانێک هەڵیفریواندم کە ئاوا تۆ بکەمە ملۆزمی خۆم لەگەڵ خۆم بتهێنم؟ ئەگەر



بە تەنیا بوایەم ئەم جەندەکەم لێنەبوایەتە بار ئێستا زۆر دوور کەوتبوومەوە و بە ئاسانی خۆم دەرباز دەکرد.»

کاستیلین گوتی:

- باشە هاوڕێ بە تەنیا بڕۆ، من بەجێ بێڵە. بۆ خۆت دەکەیتە فیدای من؟

- نا، قەت شتیوا نابێ، من ناتوانم هاوڕێیی خۆم لە نیوەی ڕێگادا بەجێ بهێڵم و بڕۆم، باسی شتیوا هەر مەکە.

ژیلین دیسان هاوڕێکەی لە کۆڵ کردەوە و بەو شێوەیە وێرستێکی دیکەی ڕێگا بڕی. هەروا بە نێو دارستانەکەدا دەڕۆیشتن و لێڕەوار کۆتایی نەدەهات. خەریکبوو وردەوردە تەمومژەکە دەڕەوی و ئەستێرەکان سریوەیان نەدەما و کاڵ دەبوونەوە. ژیلین ئەوەندە شەکەت بووبوو لەوانەبوو هەناسەی ڕاوەستێ.

لە قەراغ ڕێگاکە تووشی کانییەک بوون، دەوری کانییەکەیان بە وشکەچن هەڵچنیبوو. ژیلین ڕاوەستا، کاستیلینی دانا و گوتی:

- وەرە با تۆزێ شەکەتیمان دەرچێ و پشوویەک بدەین، چۆڕێک ئاو دەخۆینەوە و پەنچکێ کولێرە دەخەینە بەردڵمان. وادیارە زۆرمان نەماوە بگەینە شوێنی مەبەست.

ژیلین تازە دانەوییبۆوە و لێوی گەیشتبووە ئاوەکە لە پشتسەرییەوە خرموهۆری سمی ئەسپێکی بیست. دیسان بەپەلە هەستان و خۆیان خستە نێو گژ و گیای لای ڕاستی ڕێگاکە و لەوێدا خۆیان مڵاسدا.

دەنگی تاتارەکانیان بە باشی دەبیست. تاتارەکان کە خشپەکەیان بیست، گەڕانەوە بۆسەر ڕێگاکە. پێکەوە هێندێکیان ڕاوێژ کرد و پاشان

سەگێکیان بەرەڵڵا کرد و خۆشیان بە سواری ئەسپ بە دوای سەگەکەدا غاریاندا. سەگەگە هێندێکی ملۆمۆ کرد ڕاست هات بۆلای ژیلین و کاستیلین و کە چاوی بە دوو پیاوی نامۆ کەوت ڕاوەستا گوێچکەی قوت کردەوە و دەستی‌کرد بە وەڕین.

دوای چەند سات کە سەریان هەڵێنا لە چوارلاوە تاتار گەمارۆیان دابوون. تاتارەکان هەڵیانکوتایە سەریان و دوای ئەوەی دەست و لاقیان پێکەوە بەستن سواری ئەسپێکیان کردن وەڕێ‌کەوتن.

سێ‌وێرست ڕێگای بڕیبوو لە ناکاو عەبدولی ئەرباب و دوو کەسی دیکەیان لە هەمبەر خۆیاندا دی. تاتارەکان هێندێک سەریان پێکەوە نا و دوای سرتوخورتێکی کەمخایەن ئەو جووتەیان لەسەر پشتی ئەسپەکە دابەزاند و سواری ئەسپێکی‌تریان کردن و بەرەو دواوە گەڕانەوە و بەرەو گوندەکەی پێشوو وەڕێ کەوتن.

عەبدول ئیتر نە زەردەی دەنیشتە سەرلێو و نە قسەی لەگەڵ دەکردن. بەری‌بەیان گەیشتنە گوندەکە و ئەو جووتەیان لە گۆڕەپانی ئاوایی ڕاگرت، منداڵەورکە لە چوارلاوە دەورەیان دان و بە خرکەبەرد و گڵمتک و دارو قامچی پێشوازییان لێ‌کردن، لەگەڵ ئەوەشدا قسەی سووک و جنێو وەک خیز و خۆڵ بە سەریاندا دەباری.

تاتارەکان گەمارۆیان دابوون و پیرەپیاوەی پشتی گردەکەش وەک ئەوەی موویان لێ‌هەڵپڕووزاندبێ لەولاوە هات. هەموو کۆزیلکەیان بەست و دەستیانکرد بە سرتوخورت و ڕاوێژکردن، ژیلین تێگەیشت کە سەبارەت بە چارەنووسی ئەوان مشتومڕیانە و خەریکن پیلانیان بۆ



دادەڕێژن. تاقمێک دەیانگوت لەوە زیاتر نابێ لەم شاخ و کێوە ڕایانگرین و واچاکە ئازادیان بکەین با بڕۆن، بەڵام پیرەپیاو دەیگوت:

«دەبێ بیانکوژن و لە نێویان بەرن.» عەبدول هاواری لێ‌هەستا و دەیگوت:

«ئاخر من خۆ نەمدۆزیونەتەوە، بۆ هەرکامیان کۆڵێکم پارە داوە و دەبێ پارەکەی خۆمم وەدەست بکەوێتەوە و قازانجێک بکەم.»

بەڵام پیرەپیاو دەیگوت:

«دڵنیابە ئەوانە دینارێکت پێ‌ناگەیێنن و لە نەگبەتی و چارەڕەشی زیاتر هیچ شتێکی دیکەیان بە نێوچاوانەوە نییە. بۆ نازانی ڕاگرتن و نان‌پێدانی ڕووسی چ تاوانێکی گەورەیە؟ واچاکە هەردووکیان بکووژن و کۆتایی بەم گێرەو کێشەیە بێنن.»

تاتارەکان بڵاوەیان کرد. ئەرباب چوو بۆلای ژیلین و پێی‌گوت:

– ئەگەر هەتا حەوتووی دیکە لە لایەن بنەماڵەکانتانەوە پارەم بە دەست نەگا، دڵنیابن دەتانکووژم و لەوە زیاتر مۆڵەتتان نادەم. ئەگەر جارێکی‌تر خەیاڵی هەڵاتن بە سەرتاندابێ وەک سەگ دەتانتۆپێنم. نامە بنووسە باشە، نامەیەکیش بۆ ئەو نەگبەتە بنووسە!

کاغەزیان بۆ هەردووکیان هێنا. هەردووکیان نامەیان نووسی. دوای ئەوە زنجیر و سندمیان لەپێ قایم کردن و بردیانن بۆ پشت مزگەوتەکە و لەوێ چاڵێکیان هەڵکەندبوو کە سێ مەتر قووڵ بوو، هەردووکیان خستنە نێو چاڵەکەوە.

## (٦)

لەو باروودۆخە تاڵەدا زنجیر و سندم لەپێ ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ژیانیان ناخۆشتر و پڕئازارتر دەبوو. زنجیر و سندمیان لە لاقیان نەدەکردەوە و تاریکایی نێو چاڵەکە و ژانی لاقوقولیان ئاراو قارای لێهەڵگرتبوون. لەجیاتی نان و خواردن وەک سەگ لەتێک سەولەیان بۆ فڕێ دەدان. لە گۆزەیەکیشدا ئاویان بۆ ڕادەهێڵانە خوارێ. بۆگەنی پیسی نێو چاڵەکە و تەڕبوونی ژێریان هەوای نێو چاڵەکەی قورس کردبوو و خەریک بوو هەناسەیان ڕاوەستێ. کاستیلین لەو بارودۆخە نالەبارەدا بەجارێ نەخۆش و کەلەلا کەوتبوو. جەستە و لاقوقولی ماسیبوون، جەستەی شەکەت و برینداری ژانی دەکرد و ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو. لەحەیبەت ئازاری لەشی خەو نەدەچووە چاوی.

بەڵام ژیلین مات و بێدەنگ دادەنیشت و هەستی دەکرد تووشی بارودۆخێکی زۆر نالەبار و پڕمەترسیی بوون و نەیدەزانی چۆن و بە چ فێڵ و تەڵەکەیەک خۆی دەرباز بکات.

دەستیکرد بە هەڵکەندنی چاڵەکە و نەیدەزانی گڵە زیادییەکە بڕێژێتە کوێ، بۆیە ئەرباب پێیزانی و هەڕەشەی لێکرد کە جارێکیتر کاری وابکات دەیکووژێ.

ڕۆژێک کە لە نێو چاڵەکەدا هەڵتووتەکابوو و بیری لە ژیان و ئازادی دەکردەوە و هەناسەی ساردی هەڵدەکێشا، لەپڕ دیتی کولێرەیەک کەوت بەسەر ئەژنۆیدا و دوای ئەویش هێندێکی گێلاس کەوتە خوارێ. کە سەری هەڵبڕی چاوی بە دینا کەوت. دوای ئەوەی



چاوی لە ژیلین کرد پێکەنینێکی شیرین و منداڵانە لە لێوی هەڵفڕی و بە هەڵاتن لە لێواری چاڵەکە دوور کەوتەوە.

ژیلین لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «بڵێی دینا یارمەتیم بدات؟» بە نینۆخ دەستیکرد بە هەڵکەندنی تەرکی چاڵەکە و بە قوڕ پەیکەری مرۆڤ و ئەسپ و سەگ و... دروست کرد: لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «ئەگەر ئەمجارە دینا بێتەوە ئەم پەکەرانەی پێدەدەم.»

بەڵام سبەینێی ئەو ڕۆژە دینا نەهات، ژیلین خرمەی سمی ئەسپەکانی بیست کە دیاربوو تاتارەکان بۆ بەجێهێنانی نوێژ و تاعەت بەرەو مزگەوت دەڕۆیشتن، بەدەم ڕێگاوە و لەسەر ئەسپەکان سەرگەرمی باس‌و مشتومڕ بوون سەبارەت بە ڕووسەکان. لە نێویاندا دەنگی کابرا پیرەی ناسییەوە. بەڵام بە جوانی لە قسەکانیان حاڵی نەدەبوو، تەنیا ئەوەندەی بۆ دەرکەوت کە ڕووسەکان هەتا نزیک گوندەکەی ئەوان هاتوون و تاتارەکان بەجارێ ترسیان لێنیشتووە و خەمی ئەوەیانە ڕووسەکان دەست بەسەر گوندەکەیاندا بگرن، بۆیە لە بیری ئەوەدابوون کە چۆن لەگەڵ ئەو دیلانە هەڵسووکەوت بکەن.

دوای باس و مشتومڕەکە بڵاوەیان کرد و هەریەکەی بەلایەکدا ڕۆیشتن. دوای تاوێک لەپڕ ژیلین هەستی کرد ترپەی پێیەک دێت کە سەری بەرز کردەوە دیتی دینا لەسەر لێواری چاڵەکە هەڵترووشکاوە و سەری خستۆتە بەینی هەردوو چۆکییەوە و بە چاوانی پڕ لە پەژارەوە لێیدەڕوانێ، ملوانکەکەی ملی بە جوانی بریقەی دەهات و لەسەر سنگی لەرەی دەهات و چاوە ڕەشەکانی وەکوو ئەستێرە دەدرەوشانەوە.

دینا دوو کولێرە چەورەی لە باخەڵی دەرهێنا و بۆ ژیلینی خستە خوارێ، ژیلین کولێرەکانی هەڵگرتەوە و گوتی:

– بۆچی ماوەیەک بوو دیار نەبووی؟ چاو لێکە ئەو بووکەڵانەم بۆ درووست کردووی. هانێ بیگرە، ئەوانەم بۆ تۆ دروست کردووە. دەستی کرد بە هەڵدانی بووکەڵەکان بەڵام دینا گرینگی پێنەدەدان و دەتگوت هەر نایانبینێ.

دینا گوتی: نامەوێ! دوای هێندێ بێدەنگی دانیشت و لەگەڵ ئەوەی بە دەستی ئاماژەی بە ملی خۆی دەکرد ژیلینی تێیگەیاند و گوتی:

– ئیڤان دەیانهەوێ تۆ بکووژن.

– کێ دەیهەوێ من بکووژێ؟

– باوکم. ڕیشسپییەکانی ئاوایی داوایان لێکردووە کە بتکووژێ. من زۆرم خەمی تۆیە و نازانم چبکەم؟

ژیلین گوتی: ئەگەر ڕاست دەکەی و خەمی منتە، کارێکم بۆ بکە، ئەگەر دەتوانی دارێکی درێژم بۆ بێنە.

کچە لەگەڵ ئەوەی سەری هەڵدەتەکاند گوتی: شتیوا هەر نابێ.

ژیلین دەستی جۆرێک بەرز کردبۆوە دەتگوت دۆعای بۆ دەکات و لێیدەپاڕێتەوە.

– دیناگیان، تکات لێدەکەم، دینا خۆشەویستەکەم، دارێکی درێژم بۆ بێنە، دیناگیان.

دینا لە وەڵامدا گوتی: ئاخر شتیوا هەر نابێ. هەموو خەڵکی گوندەکە لە ماڵێن و دەمبینن. ئەوەی گوت و پێیپێوەنا و هەڵات.



شەوێ ژیلین لە نێو چاڵەکەدا دانیشتبوو و بیری دەکردەوە: «بڵێی چیمان بەسەر بێ؟» لەپەستا چاوی لە ژوورسەری دەکرد. ئەستێرە بە ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە و مانگ هێشتا هەڵنەهاتبوو. مەلا بانگی خەوتنانیدا و جارێکیتر بێدەنگی باڵی بەسەر گوندەکەدا کێشایەوە. ژیلین دیسان خەیاڵ هەڵیگرتەوە و لەگەڵ بیرکردنەوە وەنەوزی دەدا. لە دڵی خۆشیدا دەیگوت: «هەی کچۆڵەی ترسەنۆک.»

لەو بیر و خەیاڵانەدا بوو کە لەپڕ لە ژوورسەریەوە گڵ و خۆڵ داوەری و دیتی کە سەری دارێکی درێژ خەریکە بە دیوارەی چاڵەکەدا دێتە خوارێ و بە هێواشی گەیشتە تەرکی چاڵەکە. ژیلین لە خوشیانا خەریکبوو شاگەشکە بێ و بەپەلە دەستی بردە پێشێ و دارەکەی گرت. کە دەستی پێدا هێنا وەبیری هاتەوە کە پێشتر ئەو دارەی لە سەربانی ماڵی ئەربابەکەی دیتووە. سەری هەڵێنا، ئەستێرەکان بەسەر سینگی ئاسمانەوە دەدرەوشانەوە و چاوەبرکێیان لەگەڵ زەوی دەکرد. لەسەر لێواری چاڵەکەوە چاوانی ڕەش و گەشی دینا، ئەو کچۆڵە دڵنەرم و بەوەفایە، وەکوو چاوانی پشیلە کسکەیان دەهات. کچە لەگەڵ ئەوەی بە تەواوی خۆی دانەواندبوو و سەری بردبووە نێو چاڵەکەوە ڕوومەتی بە دیوارەی چاڵەکەوە نابوو بە سرتە دەیگوت:

– ئیڤان، ئیڤان! ـ دەستێکی بە ڕوومەتی خۆیەوە نابوو و لەپەستا بە سرتە دووپاتی دەکردەوە: ئیڤان، هێواش، لەسەرەخۆبە.

ژیلین گوتی: چییە، چبووە؟

– هەموو لە ئاوایی دوور کەوتنەوە و ڕۆیشتن، تەنیا دوو کەس لە نێو دێ ماوین.

ژیلین گوتی:

– زۆر چاکە، کاستیلین هەستە، لانیکەم با بۆ دوایینجار بەختی خۆمان تاقی بکەینەوە، هەستە با بڕۆین. خەمت نەبێ من لەکۆڵت دەکەم، هەستە با وەسەرکەوین.

کاستیلین تەنانەت نەیدەویست گوێ بۆ قسەکانیشی ڕاگرێ، گوتی: نا، من وای بە باش دەزانم هەر لەم چاڵەدا بمێنمەوە، من بچم بۆ کوێ؟ لە کاتێکدا هیچ وزە و توانایەک لە خۆمدا شک نابەم و برستم لێبڕاوە؟

– کەوایە من دەڕۆم، تۆش خەم مەخۆ، پاشان ماچوومووچی لەگەڵ کاستیلین کرد و سەری دارەکەی گرت و داوای لە دینا کرد توند سەری دارەکەی بۆ بگرێ تاکوو بتوانێ پێیدا وەسەرکەوێ. دووجار هەتا نیوەی دارەکە سەردەکەوت بەڵام دەخزایەوە خوارێ. هۆی خزانەوە خوارێشی ئەو زنجیر و قوفڵە دارینە بوو کە لە لاقی شەتەک درابوو، چونکە نەیدەهێشت بە باشی لاقی هەڵێنێتەوە و بەری پێی لە دارەکە گیر بکات. ئاخری لە خوارەوە کاستیلین یارمەتیی‌دا و ژیلین هەرچۆنێک بوو وەسەر کەوت و خۆی لە چاڵە شێدارەکە دەرباز کرد. دینا لەگەڵ ئەوەی بە دەستە کز و بێهێزەکەی کراسە کۆن و دڕاوەکەی ژیلینی گرتبوو و بە هەموو هێز و قەوەتی خۆی یارمەتیی دەدا لە خۆشیانا پێکەنینیشی دەهات.

ژیلین دارەکەی لە نێو چاڵەکە دەرکێشا و گوتی:

– دینا ئەو دارەت لە هەرکوێیەک هێناوە بیبەوە جێی خۆی داینێوە. بەڵام وریابە هیچ کەس نەزانێ، بێتو بزانن دەتکووژن. ژیلین دوای ئەوەی دەستی بە سەری کچۆڵەکەدا هێنا و بە دڵ سپاسی لێکرد و



لاواندییەوە بەرەو کێوەکە وەڕێکەوت. دیناش دارەکەی هەڵگرت و بە هێواشی بردی لە جێی خۆی داینایەوە. ژیلین کە گەیشتە سەرکێوەکە بە بەردێک دەستیکرد بە شکاندنی قوفڵ و زنجیرەکەی لاقی، بەڵام قوفڵەکە هێندە قایم بوو بۆی نەدەشکا، هەر لەو کاتەدا لە ناکاو خشپەی پێیەکی بیست، بەپەلە خۆی کۆ کردەوە و لە پەنا دەوەنێک خۆی حەشاردا، کە گوێی هەڵخست و هەناسەی لە سینگیدا کۆ کردەوە بۆی دەرکەوت کەسێک لە داوێنی کێوەکەوە بە هەڵەداوان بەرەولای ئەو دێت. لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە «حەتمەن دەبێ دینا بێت.» دینا بە هەناسەبڕکێ گەیشتە لای ژیلین و داوای لێکرد بەردەکە بدات بە ئەو. گوتی:

– دا بیدە بە من، ئێستا دەیشکێنم.

لەسەر چۆک دانیشت و زنجیر و قوفڵەکەی تۆزێ ئەمبارەوبار کرد. دەستە کز و بێهێزەکانی ئەو تواناییەیان نەبوو کە ئەو قوفڵە قایمە بشکێنن. دوای هێندێک هەوڵدان بەردەکەی فڕێدا لایەک و دەستیکرد بە گریان، چونکە هەستی بە بێهێزی دەکرد و نەیدەتوانی ئەوکارە جێبەجێ بکات. ژیلین دیسان دەستیدا بەردێک و بڕێکی دیکەی پێوە خەریکبوو، دیناش هەروا چۆکی دادابوو و دەستی بە شانی ژیلینەوە گرتبوو. ژیلین چاوێکی لەلای چەپی کێوەکە کرد و تیشکێکی مەیلەوسوور کە لە پشت کێوەکەوە دەهاتە دەرێ سەرنجی ڕاکێشا. ئەو تیشکە تریفەی سووورباوی مانگ بوو کە خەریک بوو لە تیرەشانی کێوەکەوە دەهاتە دەرێ و دەیویست ئەو دەشت و چیا و چۆڵە تریفەباران بکات. ژیلین لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە «چاکە هەتا

مانگەشەو وڵاتی ڕووناک کردۆتەوە دەبێ هەوڵ بدەم و خۆم بگەیەنمە لێڕەوارەکە.» چونکە لە شکاندنی قوفڵ و زنجیرەکە هیوابڕاو بوو، بە ناچاری بەردەکەی فڕێدا لایەک و بە خۆی گوت «چارەیەکی‌ترم نییە دەبێ هەروا بەم قوفڵ و زنجیرەوە ڕێگا ببڕم و هەوڵ بدەم خۆم ڕزگار بکەم.

گوتی: دیناگیان، خۆشەویستەکەم، خوداحافیز. من هەتا ئەوکاتەی ماوم چاکەی تۆم لە بیر ناچێتەوە و هەمیشە لە دڵمدای.

دینا دەستی بە قۆڵی ژیلینەوە گرتبوو و دەیویست دڵنیابێ کە ژیلین ئەو نان و کولێرانەی لەگەڵ خۆی بردووە کە بۆی هێنابوو، خێرا خێرا خەریکبوو کولێرەکانی دەخستە باخەڵی ژیلینەوە. ژیلین نان و کولێرەکانی لە باخەڵیدا دابین کرد و گوتی:

– زۆر زۆرت سپاس دەکەم کچۆڵە جوان و مێهرەبانەکەم. من لێرە نەبم ئیتر هیچکەس نییە بووکەڵەت بۆ دروست بکات. ژیلین بە دڵسۆزی و مێهرەبانییەکی باوکانەوە دەستی بە سەروقژیدا دەهێنا. دینا دەستی‌کرد بە گریان و هەردوو دەستی بەبەر چاوییەوە گرت و وەک کاژیلەیەکی پەیت و چاپک بە کێوەکەدا داگەڕا و هەڵاتەوە بۆ ماڵێ. کاتێک سەرەوخوار هەڵدەهات و قەڵەمبازی دەدا خرینگە و خڕەی خەناوک و قەرەپووڵەکانی ملی لە دوورەوە دەبیسترا.

ژیلین خاچی خۆی کێشا و بۆ ئەوەی هیچکەس گوێی لە تەقوکوتەکەی نەبێ بە دەستی زنجیر و قوفڵەکەی لاقی گرت و بە کۆمەکۆم و لارەوە لارەوە وەڕێکەوت. لەگەڵ ئەوەی دەڕۆیشت و بەردەوام هەڵدەنگووت و لاتراسکەی دەبەست، چاوێکیشی هەر لە



ئاسۆ بوو کە بۆی دەرکەوێ مانگ لە کام لاوە هەڵدێ. ئەو شارەزای ڕێگاکە بوو. دەبوو نزیکەی هەشت وێرست بەو قوفڵ و زنجیرەوە ڕێگا ببڕێ. تەنیا خەم و گرفتیشی ئەوەبوو کە هەتا مانگ هەڵنەهاتووە و وڵاتی ڕووناک نەکردۆتەوە خۆی بگەیەنێتە لێڕەوارەکە. ئەو لە کێوەکە داگەڕا و لە چۆمەکە پەڕییەوە کە تریفەی زێوینی مانگ لە ئاسۆوە هاتە دەر و وردە شەپۆلی چۆمە زووڵاڵەکە کەوتنە برینجە کردن. بەبێ ڕاوەستان سەرنجی دەوروپشتی خۆی دەدا و هەوڵی دەدا ڕێگای لێ‌نەشێوێ. لە لایەکی‌تریشەوە مانگ جارلەگەڵ جار زیاتری دەرودەشتەکە ڕووناک دەکردەوە و زەویی تریفەباران دەکرد، بەرز و بەرزتر دەبۆوە و سپی هەڵدەگەڕا. ژیلین هەوڵی دەدا خۆی بگەیەنێتە لانساری کێوەکە و بە نێو دار و دەوەنی لاپاڵی کێوەکەدا بڕوات و تارمایی و تاپۆکەی نەبیندرێ. هەوڵی دەدا هەرچی زووتر خۆی بگەیێنێتە نسارەکە بەڵام مانگ لە ئەو گورجو گۆڵتر بوو دەیویست زۆر بەپەلە و خێرا خۆی بگەیەنێتە تاقی ئاسمان و دنیا تریفەباران بکات. هەروا هەنگاوی دەنا و کەوتبووە هەناسەبڕکێ. کە سەری هەڵبڕی و چاوی لە ئاسۆ کرد دیتی مانگ بە تەواوی هاتۆتە سەر و وڵاتی وەکوو ڕۆژ ڕووناک کردۆتەوە. زۆری نەمابوو بگاتە نێو دارو دەوەنەکان. گەڵا و لکو پۆپی دارەکان بە جوانی دەبیندران و گەڵا تەڕ و تەرچکەکانیان لەبەر تریفەی مانگەشەو دەبریسکانەوە. بێدەنگی و ڕووناکی شاخ و دەشت و لێڕەوارەکەی داگرتبوو. دەتگوت دەشت و چیا و دۆڵ خەوی مەرگ دایگرتووە. تەنیا دەنگێک کە ئەو بێدەنگییە کڕ و سامناکەی دەشکاند خوڕەی چۆمەکە بوو کە لە چەند جێگای خوڕین

ئاو و بەردی ئاوەسوو سەریان لێک دەساوی. بەختەوەرانە بەبێ ئەوەی بە چاو بکرێت و لووتی بە لووتی کەسێکدا بتەقێ خۆی گەیاندە نێو لێرەوارەکە و بۆ پشوودان و حەسانەوە سووچێکی تاریکی هەڵبژارد و شەکەت و ماندوو دانیشت و ماوەیەک خۆی لە گەزدا.

دوای ئەوەی تۆزێ پشووی هاتەوەبەر و حەسایەوە کولێرەیەکی لە باخەڵی دەرهێنا و خواردی پاشان هەستا بەردێکی دیتەوە و دیسان دەستی کردەوە بە کوتانی زنجیر و قوفڵەکە و ئەختوچاری دەکرد بۆی نەدەشکا. دەستوپلی هەموو بلۆقیدا و بریندار بوو بەڵام قوفڵەکەی بۆ نەشکا. بۆیە بە ناچاری هەستا و بەسەر ڕێگای نێوان دارەکاندا ملی ڕێگای گرت. نزیکەی وێریستێکی ڕێگا بڕیبوو کە هەستی کرد بەجارێ هێز و توانای لێبڕاوە و لاقوقولی هەمووی کوڵەوار بووە. چەند هەنگاوی دیکەی هەڵێنایەوە و ڕاوەستا. لە دڵی خۆیدا گوتی «جگە لە ڕێگابڕین هیچ کارێکی دیکەم لە دەست نایە. ئەوەندەی هێز و توانام هەیە دەبێ هەوڵ بدەم و درێژە بە ڕێگاکە بدەم. ئەگەر دانیشم لەشم سارد دەبێتەوە و ئیتر ناتوانم لە جێی خۆم ببزووم.» ئەوشەوە هەتا بەرەبەیانی ڕێگای بڕی و تەواوی وزە و توانای خۆی خستە کار. کە ڕۆژ بۆوە لە سووچێکی چڕی دارستانەکەدا خەوت و بە تەواوی شەکەتی لە لەشی دەرچوو. ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە لەو شوێنە مایەوە و کە شەو بەسەردا هات دیسان ڕێگای گرتەوەبەر. ئەو شەوەش هەتا ئەوکاتەی مانگ لە ئاسۆ هەڵات ڕێگای بڕی و لە هیچکوێ وچانی نەدا. بەڵام لە ناکاو هەستیکرد دوو پیاوی تاتار دەنگیان دێت و بە سواری ئەسپ بە ڕێگای نێو دارستانەکەدا دێن و خەریکن لێی نزیک دەبنەوە.



بۆیە وەک تێسکەی تفەنگ خۆی لە ڕێگاکە کلا کرد و لە پشت دەوەنێک خۆی حەشاردا.

تریفەی ڕووناکیبەخشی مانگ وڵاتی داگرتبوو. شەونم و خوناوەی ڕوونی سەرپەلک و گەڵای دار و گیا لە نزیکەوە دەبیندرا. بەڵام ژیلین هێشتا نەیتوانیبوو خۆی بگەیەنێتە ئەوپەڕی دارستانەکە، لە دڵی خۆیدا گوتی: «واچاکە هێندێکیتر گوشار بۆ خۆم بێنم، لانیکەم سێ هەنگاوێکی تر بنێم و لە نێو ئەم لێرەوارەدا شوێنێک بۆ وچانگرتن و حەسانەوە پەیدا بکەم.» دوای ئەوەی سێ هەنگاوێکیتری نا بۆی دەرکەوت گەیشتۆتە کۆتایی دارستانەکە و دەشت و کێوەکانی لێوەدیار کەوت. هەتا کۆتایی لێرەوارەکە چووە پێشێ و ئیتر تریفەی زێوینی مانگ دەشتەکەی وەک ڕۆژ ڕووناک کردبۆوە. بیابانێکی پان و بەرین و قەڵایەکی لە هەمبەر خۆیدا بەدی کرد. لەلای دەستە چەپی داوێنی کێوەکەشەوە ئاورێک بڵێسەی دەکێشا و دووکەڵەکەی سپی دەچۆوە و چەند کەس وەک تاپۆ و تارمایی لە دەوری کۆزیلکەیان بەستبوو.

ژیلین بە وردی سەرنجیدا و بریقەی تفەنگی سەربازی قازاخەکانی ناسییەوە. شادی و نەشەیەکی لەڕادەبەدەر سەرتاپای داگرت و هەموو وزە و توانای خۆی خستەکار و بەرەو کێوەکە وەڕێ کەوت. لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە و دەپاڕایەوە: «خودایەگیان یارمەتیم بدە و کارێک بکە لەم بیابانە کاکی بەکاکی و چۆڵوهۆڵەدا سوارێکی تاتاری چاوی پێمنەکەوێ، ئەگەرچی لە سەربازەکانی خۆمان نزیک بوومەتەوە بەڵام بەمحاڵە شڕەمەوە...»

هەر لەوکاتەدا کە نوقمی فکر و خەیاڵ بوو لە ناکاو دیتی لەسەر گردێکی دەستە چەپی دەشتەکە بە مەودای دووسەد مەتر سێ تاتار ڕاوەستاون. تاتارەکان هەرکە چاویان بە ژیلین کەوت بە پرتاو بەرەولای ئەو سووڕان و لەگەڵ ئەوەی قامچییەکانیان هەڵدەسووڕاند و لە کەفەڵی ئەسپەکانیان ڕادەکێشا، بە غار و تەقڵەکوت بەرەولای ژیلین هاتن.

ژیلین بە دیتنی ئەوان دڵی داکەوت و لەگەڵ ئەوەی دەستی ڕادەتەکاند ئەوەندەی هێزی تێدابوو و دەنگی دەردەهات هاواری کرد:

- هاوڕێیان! یارمەتیم بدەن! هاوڕێیان!

دوای ئەوەی سەربازەکان دەنگی ژیلینیان بیست. ئەسپەکانیان تاودا و بە تەقڵەکوت بەرەو لای تاتارەکان هاتن. ژیلین ئەگەرچی لە تاتارەکان نزیکتر بوو و لە قازاخەکان دوورتر بەڵام هەموو هێز و توانای خۆی خستەکار و بە دەستی قوفڵ و زنجیرەکانی لاقی گرت و بە کۆمەکۆم بەرەولای قازاخەکان هەڵات. ئەگەرچی هوش و ئیختیاری لەلا نەمابوو و کەوتبووە دڵەکوتێ و هەناسەبڕکێ، هاواری دەکرد و لە مەسیح دەپاڕایەوە:

- هاوڕێیان! هاوڕێیان! هاوڕێیان!

قازاخەکان نزیکەی پازدە کەس بوون. بۆیە ترسیان خستە دڵی تاتارەکانەوە و ناچاریان کردن لە جێی خۆیان نەبزوون و لەوە زیاتر نەیانوێرا بێنە پێشێ. ژیلین بە هەڵەداوان ڕۆیشت بۆلای قازاخەکان و خۆی پێگەیاندن.



قازاخەکان دەورەیاندا و لێیان دەپرسی کێیە و چکارەیە و لەکوێوە دێ؟

بەڵام ژیلین ئیتر دڵی لەخۆ بووبۆوە و لە خۆشیانا هۆن هۆن دەگریا و دەیگوت:

- هاوڕێیان! هاوڕێیان!

سەربازانی پیادە کە بەدوای سوارەکاندا هاتبوون خۆیان گەیاندە لای ژیلین و هەرکام بڕێکیان نان و ئاش و ڤۆدکا پێدا. باڵتە و قاپووتیان لەبەر کرد و چەند کەسیان دەستیانکرد بە شکاندنی قوفڵ و زنجیری لاقی.

ئەفسەرە ڕووسەکان ژیلینیان ناسییەوە و بەرەو قەڵاکە بەڕێیان کرد. سەربازەکانیش بە دیتنی ئەو شادی و نەشە دایگرتن و دۆست و هاوقەتارەکانی لە دەوری کۆ بوونەوە.

ژیلین ئەوەی دیتبووی و بەسەری هاتبوو تاملی کردبوو هەمووی لە نووکەوە بۆ گێڕانەوە:

بەڵێ ئەمەش بەسەرهاتی چوونەوەم بۆ ماڵێ و دیتنی دایکم و ژنهێنانم! نا وادیارە چارەنووسی من ئەوە نەبووە.

ژیلین لە قەفقاز مایەوە و درێژەی بە خزمەتدا. بەڵام کاستیلینیان دوای مانگێک بە پێدانی پێنج هەزار مەنات لە تاتارەکان وەرگرتەوە کە بەحاڵ ڕۆحی لەبەردا مابوو.

ژوئەنی

## فەرهەنگۆک

**ئاخێز:** سەرهەڵدان، ڕاسان، هەستان

**ئاریشە:** کێشە، گرفت

**ئێزنگ:** سووتەمەنی، کۆلکەدار بۆ سووتاندن

**ئەوق:** نوقم، غەرق

**باویلکە:** پەپوولەپایزە، پشیلۆکە، پشیلەپایزە

**بوودڕ:** قوولک و کەندری قووڵ کە ڕووناکایی لێی نادا

**بۆسە:** ڕەبەت، کەمین

**بیچم:** شێوە، ئەدگار، ڕواڵەت

**بە پێی فیلان:** بریتی لە زۆر و زەوەندە

**بەرەڤانی:** بەرگری، دیفاع

**پاپەزێن:** پارییەکە بە وەرەق دەکرێ. پەڕێن

**پلوورە:** کەندووی مێشەنگوین

**پێمل بوون:** ڕازی بوون لە ڕووی ناچارییەوە

**پەترۆ:** قەتماخە، قرماخە. خوێنی وشکەڵاتووی سەر برین

**پەرجۆ:** مۆجیزە (معجزە)

**پەنیجە:** پەیژە، نێردیوان، پاینجە

**تامڵ کردن:** تاقەت هێنان، بەرگە گرتن

**تیفتیفە:** بریتی لە تاشین و زۆر چاک لووس کردنی ڕیش

**تیماج:** قایشی نەرم و لووس بۆ باڵتە و قەنەفە و کڵاو

**تەنەوە کردن:** پەرە گرتن، تەنینەوە بە تایبەت بۆ نەخۆشی

**جامەلووسکێ:** ڕیایی، مەرایی، ماستاوچییەتی، تەشیڕێسی



**جینگنۆکە:** شەڕانی و بە پرتەوبۆڵە، کەمتاقەت و تووڕە و ئاڵەتی

**چپڕ:** چڕوپڕ، لێڕەواری زۆر چڕ

**چنۆک:** چکووس، ڕژد، سەقیل، ڕەزیل، جەبوون

**خۆماک:** غەریزی، بە شێوەی خۆماک، بە شێوەی غەریزی

**دۆلکە:** سەتڵی چکۆڵەی ئاو، تۆنگە

**دیلمانج:** وەرگێڕ

**ڕاچێت:** نوسخەی دوکتۆر کە دەوا و دەرمانی تێدا دەنووسێ

**سندم:** کۆت و زنجیری پێی دیل و زیندانی

**شوو لێ هەڵکێشان:** بریتی لە بێحەیایی و سەرەڕۆیی لە ڕادە بەدەر

**شەرزە:** بریندار و کوتراو، کۆڵەوار

**شەڵغە:** پوورە، تێکهاڵانی هەنگ بە چڵەدار و گیایەکەوە

**فحێڵ:** لە تاوان شۆرانەوە، بێبەری بوون لە تاوان (تبرئە)

**قورساخ:** ویقار، سەنگینی

**کسکە:** بریقەی چاوی پشیلە و ڕێوی و.. لە شەودا

**کلکەسووتێ:** بریتی لە ماستاوچییەتی، تەشیڕێسی، مەرایی

**کندێلە:** کەنەف، گیایەکە بۆ بەن و جلوبەرگ دەبێ

**کوتوپچڕ:** قسە کردن بە شڵەژاوی و زمان تێکەڵهاتنەوە

**کۆزیلکە بەستن:** کۆ بوونەوە لە دەوری یەک، سەر پێکەوەنانی چەند کەس

**کەمجیکەڵدانە:** بریتی لە کەمتاقەت و ئاڵەتی

**گت گرتن:** تۆزە ڕاوەستان لە قسەکردندا (مکث)

**گولدوزام**: شلّی و پەڵەی سەر پێست کە زیاتر بە کەسانی سپی و کاڵوکرچەوە دەبیندرێ

**گوێقوڵاخ**: زیت و وریا و لەسەر هەست

گەڕەلاوێژ: بە نۆرە گۆرانی گوتن لە کۆڕێکدا

**لاتراسکە** بەستن: سەرەنگرێ بوون

**ماریجە**: چارەسەر، (معالجە)

**مامزە**: قیتکەیەکی تیژە بە پشتی جزمە و پۆستاڵەوە سوار بۆ لێخوڕینی یەکسم لە بەر زگ و لاتەڕافی دەکوتێ

**نقشک**: سەرتوێی شیر، خامە

ودم: ئیجازە، مۆڵەت

**هەڵمەقووت**: قووتدان بە گورجی و خێرایی

**هەڵەسوون**: شین بوونەوە، سەرهەڵدانەوە

**هەڵەنگووتن**: سەرسمدان، هەڵکەوتن

**هەمار**: عەمبار، ئەمبار

**یەکهاوی**: یەکڕەواڵ (یکنواخت)



**بەرهەمی بڵاوکراوەی وەرگێڕ**:

١. تاپۆی وەرزێکی سەوز، شیعر، ١٩٩٧

٢. شەوەژانی ئەستێرەیەک، شیعر، ٢٠٠٠

٣. مەرگەخەون، شیعر، ٢٠٠٣

٤ـ دیسان لەو شەقامانەوە، کۆچیرۆکی بیژەن نەجدی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٥. تەپڵی ئاور، کۆچیرۆکی بیانی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٥

٦ـ جێگەی بەتاڵی سلووچ، ڕۆمان، مەحموود دەوڵەتئابادی، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٦

٧. خۆر و لاولاو، کۆشیعری منداڵان، ٢٠٠٧

٨. برایانی کارامازۆف، ڕۆمانی داستایۆڤسکی، وەرگێڕان ٢٠٠٧

٩. یەکگرتن، چیرۆکی منداڵان، قودسی قازی نوور، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٧

١٠. خولیای نووسین، ڕەزا بەراهەنی، کۆمەڵەوتار، وەرگێڕدراو، ٢٠٠٨

١١. فەرهەنگی ڕێژگە (ئەو وشانەی لە هەمبانەبۆرینەدا نین)، ٢٠٠٩

١٢. کەڵەشێری ورگن، گێڕانەوەی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، ٢٠١٠

١٣ـ تازیەبارانی بەیەل، ڕۆمان، غولامحوسێن ساعیدی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

١٤. ئاناکارنینا، ڕۆمان، لیۆن تۆلستۆی، وەرگێڕدراو، ٢٠١٠

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١ـ نارنجیفڕین، کۆچیرۆک

٢ـ دار و پەپوولە و ڕووبار، چیرۆکی منداڵان، فەریدە شەبانفەڕ، وەرگێڕدراو

٣ـ سترانی شەپۆلەکان، شیعری هاوچەرخی فارسی، وەرگێڕدراو

4ـ ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆچیرۆک، وەرگێڕدراو

٥ـ ئەرباب و نۆکەر، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

٦ـ باوە سیرگی، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

ـ دیلی قەفقاز، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

ـ مەرگی ئیڤان ئیلیچ، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕدراو

ـ ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر

ـ زایەڵەی شاخ و قیژەی گوڵەباخ، کۆمەڵە شێعر

ـ هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شێعر

سەرچاوە: اسیر ققفاز، لیو تولستوی، ترجمەی سادق سرابی، چاپ اول،زمستان٥ تهران انتشارات فرخی